## لەم ژمارەیەدا




الاشراف الفني : ص . ع

سەر نووسەر
مصلح مصطفى جەلالي

رۆشنبیری نوێ
گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی مانگانەیە
دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

وتەی ژمارە

# سوپای میللی پشتی سوپای دلێرە



تەجرەبەی دامەزراندنی سوپای دلێری میللی لەعیراقا ، یەکێکە لەو تەجرەبە بایەحدارانەیە کەسەرکردایەتی حیزب‌و شۆڕش لەساڵی ١٩٧٠دا . هێنایەکایە ، چونکە ئەم سوپایە پێوەندیەکی بەتینی بەخەباتی بێوچانی گەلەوە هەیەو لەهەمان کاتیشا بەهێزکردنی گیانی سوپایی‌یە لەلای کۆمەلانی خەلك . .

بەتایبەتی لەم قۆناغەی کەشۆڕشی پیرۆزی ١٧ی تەمووزی پێتیدەپەڕێ ، کە پێویستیەکی زۆری بەخۆئامادەکردنێکی فراوان هەیە ، بۆ روبەروبوونی مەترسی نەخشەکانی ئیمپریالیزم‌و زایۆنیزمی دوژمن .

هەربۆیەشە سەرکردایەتی حیزب‌و شۆڕش ، لەسەرەتای شۆڕشەوە ، بڕوایەکی بتەوی بەرێکخستنی ریزەکانی گەل‌و بە ئامادەکردنێکی بەردەوامی گەلەوە هەبوەو هەیە ، لەوانەیش : مەشقکردنی بێوچانی رۆڵەکانی گەلە لەسەرچەکی چەشناوچەشن . . ئەوەبوو لەساڵی ١٩٧٠دا ، ئەم ئامانجە هاتەدی‌و سەرکردایەتی گشتی سوپای میللی دامەزراو لەورۆژەوەیش تائەمرۆ ، دەورەی جۆربەجۆری مەشقکردن لەسەرانسەی ولأتا هاتۆتەکایە . .

لەراستیدا : ئەم خۆئامادەکردنە فراوانەو ئەم مەشقە بایەخدارانەی رۆڵەکانی گەل ، بۆ خزمەتی شۆڕش‌و بۆ بەرگری‌کردن لەدەسکەوتەکانی گەل هاتۆتەناو . بۆیە ئەبێ ئەم کارە بایەخێکی زۆری پێبدرێت‌و بەشێوەیەکی شۆڕشگێڕانە بەڕێوە ببردرێت‌و هەمو رۆڵەیەکی گەلەکەمانی تیدا جی‌بیتەوە . . .

سالأنی رابردووی تەمەنی سوپای دلێری میللی لەسەر خاکی عیراقا ، ئەوەی بۆ دوپات‌کردینەوە ، کە ئەم تەجرەبەیە ، تەجرەبەیەکی رابەرەو لەرۆژی ئەمرۆیدا ، قەوارەیەکی گەورەی گرتۆتەخۆو بووە بەشێوازێکی بەتین‌ونوی‌ی خەباتگێڕان‌و ئازایەتی‌و فیداکاری ، بەجۆرێکی‌وا کەهیچ جۆرە پیلانێکی ئیمپریالیزم‌و کۆنەپەرستی‌و زایۆنیزم ناتوانێ لەناوی بەرێت ، چونکە هێزی دەسوەشێنی دەوڵەتان تەنیا هەر بەسوپاکەی نیە ، بەڵکو لەهەمان‌کاتا بەهێزی لەبن‌نەهاتووی تێکڕای میللەتە . .

ئەمرۆیش کە (١٢) ساڵ بەسەرتەمەنی ، ئەم تەجرەبەیە تی‌ئەپەڕێت‌و خۆی‌لەخۆی‌دا بووە بەئامرازێکی گەورەی خەبات‌و کۆڵنەدان ، لەهەمان‌کاتا بووە بەهاوپشتێکی توندوبەتینی هێزە چەکدارەکانی گەل . . .

لەم پێودانگەوە ، دامەزراندنی سەرکردایەتی گشتی میللی لەولأتەکەماندا ، بۆیە دامەزراوە ، تا کاروانی درێژخایەن‌و سەرکەوتووی شۆڕش بپارێزیت‌و پاسەوانی لەخاك‌و لەبنیادنان بکات . .

سەرکەوتووتر بێت هەنگاوەکانی سوپای جەنگاوەری میللیمان ، هاوسوێندو هاوخوێن‌و پشتی قایمی سوپای دلێرمان ، سوپای سەرۆك صدام حوسێنی خۆشەویست .

«رۆشنبیری نوێ»



## داستانی بسێتین:

# داستانێکی تری نوێی پاڵەوانە خوێنگەرمەکانی سەدەی بیستەمە

٧٧٠ کوژراوو ژمارەییەکی زۆر



وا جارێکی تریش قارەمانانی سەدەی بیستەم ، سەربازە ئازاو دلێرو نەبەزەکانی پاڵەوانی رزگاریخوازی نەتەوەیی سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین ، بۆ فارسە دڵ پڕ لە رق‌وکینەو رووڕەشەکان‌و زایۆنیزمی رەگەزپەرست‌و ئیمپریالیزمی جیهانی دووپات دەکەنەوە کەوا جەنگاوەرە خوێن‌گەرمەکانی عیراق ، هەر شوێنێك کە سەرکردایەتی گشتی هێزەکانی چەکدار بۆیان دیار بکات‌و مەبەست داگیرکردنی بێت‌و کەڵك لەم داگیرکردنەدا هەبێت ، ئەوە پێش ئەو . ماوەی بۆی دانراوە ، بە ئیرادەییێکی پۆلاییەوە دەیقۆزێتەوەو دەیخاتە ژێر دەستی خۆیەوە .

بریندارو دیلکراو

قارەمانانی عیراق ، چونکە لەپێناوی سەرکەوتنی هەق بەسەر باتڵەوە دەجەنگێن‌و بەو پەڕی ئیمان‌و باوەڕی پتەوەوە بۆ پاراستنی ئابروو و کەرامەتی عیراقی‌یەکان‌و نەتەوەی عەرەب‌و وولات‌و نیشتمان‌دا ، چاونەترس‌و ئازاو دلێرانە چوونەتە گۆڕەپانی جەنگەوە سەربەرزن بەوەی گیانی پاکی خۆیان بکەنە قوچی قوربانی ئاوو خاك‌و شەرەفەوە .

شەڕی ئەم دووایيە لە کەرتی شیب – بسێتین – دا بە شەڕێکی پیرۆزو مەزن‌و دیار لە نێوان پاڵەوانانی قادسیەی صدام‌و سەرشۆڕو رووڕەشە بەیزاوەکانی رژێمی کۆنەپەرستی تاران‌و قوم دادەنرێ . . وە هەروەك سەرکردەی مێژوویی‌و پاڵەوانی رزگاریخوازی نەتەوەیی صدام حسین کە هەر لە ساتی دەستپێکردنی هێرشەکەوە تا بەجێ‌گەیاندنی ئەرکە سەرەکی‌یەکان لەناو گەرمەی شەڕەوە بوو ، وا وەسفی کردووە کەوا ئەم شەڕە تام‌و بۆو چێژێکی تایبەتی هەیە .

لە حەفت رۆژی بەردەوامی شەڕدا زیانی دوژمنی رەگەزپەرست‌و کوێرەوەر (٧٧٠٠) حەفت هەزارو حەفت سەد کوژراو بوو . . وە ئەوەی سەرشۆڕانە هەڵات‌و شوێنەکانی جێ‌هێشت‌و رای‌کرد.. . ئەوەی بریندار بوو . . ئەوانەی تریش بەدیل گیران .

ئەمەو سەرەڕای تێکشکاندنی ژمارەیێکی یەکجار زۆری روانگەو دەبابەو مدرەعەو ئۆتۆمبیلی گواستنەوەو تۆپ‌و رەشاشی قورس‌و ناوەندی‌و دەست‌بەسەراگرتنی ژمارەیێکی زۆری تانکەرو چەشنەها چەکی سووك‌و قورس‌و ئۆتۆمبیلی گواستنەوە کە بۆ بەکارهێنان دەست دەدەن .

بەڵێ . . داستانی بسێتین بەهەق لاپەڕەیێکی تری سپی‌و بێ‌گەرد لە تۆماری شەڕی قادسیەی صدام‌دا پێك‌دێنێت . وە حەفت رۆژی ئەم داستانەش بەحەق بە حەفت رۆژی دیارو روون‌و پیرۆزەوە لە مێژوودا دەژمێردرێن‌و بە پیتی ئاڵتوونەوە لە لاپەڕەکانی مێژوودا تۆمار دەکرێن . . وە هەمان حەفت رۆژ بەرامبەر بە فارسە رەگەزپەرستەکانەوە بە حەفت رۆژی تاڵ‌و سوێرو بەزین‌و رەشەوە تۆمار دەکرێن .

داستانی بسێتین ، کە توندو تیژترین‌و دژوارترین دەرس بوو بۆ رژێمی کۆنەپەرست‌و دارو دەستەی شەیتانی سەدەی

بیستەم خومەینی ، سەرلەنوێ ئەوەی دووپاتی کردەوە کەوا توانای قارەمانە خوێنگەرمەکانی سەرۆك صدام حسین رۆژ دوای رۆژ پترترو لە زێدەبوون دایەو قەت لەبن نایەت . . هەروەك سەرکردەی مێژوویی‌و پاڵەوانی قادسیە سەرۆك صدام حسین دووپاتی کردووەتەوە **کەوا ووزەو توانای عیراق لەبن نایەت ، چونکە تەنیا لە رووکەشی زەوی‌یەوە هەڵناقوولێ بەڵکو لە ناخ‌و قووڵایی مێژوو و لە قووڵایی ویژدان‌و زەوی و خاکەوەیە** .

پاش ئەو بەزینە عەسکەرییەو زیانە ماددی‌و بەشەرییەی دارودەستەی خومەینی رووڕەش لە کەرتی شیب – بسێتین – بە شێوەیێکی تایبەتی‌و گشت بەرەکانی تری جەنگەوە بەشێوەیێکی گشتی ، وە بەرزبوونەوەی شەڕی خوکوژی‌و ئاژاوەی ناوخۆوەو تێکچوونی باری ئابووری‌و پەشۆکاویی باری کۆمەڵایەتی‌و دەروونی لە ئێراندا ، خومەینی جادوکەر ڕایگەیاند کەوا دەیەوێ ئیتر لە سووچێکەوە بۆ خۆی هەڵتوونکێ‌و لە گۆڕەپانی رووداوەکان دوور بکەوێتەوە دوای ئەوەی کە دارودەستەکەی تێکشکاو لە ئاکامی لێدانی توندو تیژی پاڵەوانانی عیراق سەرشۆڕی‌و رووڕەشی بۆ مایەوەو پێیزەی بنکەکانی فیکری‌و سیاسی کە لەسەری وەستاوە تووایەوەو لە رەگ‌و ریشەوە قورمسان .

ئەو سەرکەوتنە عەسکەرییەی کە عیراق دژی رژێمی فارسە رەگەزپەرستەکانی وەدی هێنا ، رووڕەشانی رژێمی خستە شکستەو پەشۆکاویی‌و ئاژاوەی سیاسی‌و فیکری‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و دەروونی‌یەوە . . وە هەموو ئەو خەونە سەوزانەی رەواندەوە کە لە مێشکی بەتاڵی‌ی حوکمڕانانی تاران‌و قومدا خوولی دەخواردەوە .

بەڵێ . . رژێمی خومەینی‌و تاقەکەی لە قۆناغی دووا هەناسەیەوە دایە . . لایەنەکانی دژ بە رژێم رۆژ دوای رۆژ شوێنی بەرزتر دەگرێتەوەو لە فراوانبوون دایە . . شەڕی ئێستاشیان دژی عیراق تێکۆشەر جگە لە مردن‌و سەرشۆڕیی‌و وێران‌و زیان‌و هەڵاتن نەبێ ئەگینا هیچی تریان چنگ ناکەوێت .





# ترس و لەرزو

ئایا رژێمی هەلاهەلابووی تاران لەچی ئەترسێ . . ؟ بۆ ئەترسێو ئەی بۆ دانەچۆقەی تێکەوتوە ؟ ئەم دڵەراوکێو تۆقینە لەپایچی ؟ ئایا لەبەر ئەوەی کەوتۆتە ویزەی گەلانی ئێرانو هێزە پێشکەوتنخوازەکانی ئێرانەوە . . یا بەجارێ هەموو بەها بەنرخەکانی شۆرشە دلێرانەکەی گەلانی ئێرانی دوراندوە ، کە بەهەزاران هەزار رۆڵەی بەجەرگی لەپێناوا درا ، تا بەرپا بوو ، حوکمی نارەواترین رژێمی شایـەتی رژێمی بـەدخوازی حەمەرەزاشای گۆرکراوی تەفروتوونا کرد . .

ئەی بۆ رژێمی مەلا خومەینی ، وا بەهەڵەداوان کەوتۆتە هەرەشەو گورەشەو شالاوهێنانو خەڵك تۆقاندنو ژیان تاڵکردنو کوشتن وبرینو لافدی خوێنەوە . . ئایا بۆ داپۆشینی تـاوانـە چەشناو چەشنەکانێتی . . ؟ ئایا بەقرکردنی خەڵکی بەشەرەفو دلێری کوردستانی راپەریوی ئێران ، کوردستانی سمکۆو قازیو پارتیە پێشرەوەکان گەلی کوردی قارەمان . . سەرەرای عەرەبو بلووجو ئازەریەکان ، کارەکە مەیسەر ئـەبێو دڵە تـرساوەکـان دائەکاسێن ! ؟ . ئەم هەموو کوشتنو برینەیش ، ئەم هەمووماڵوێرانیو ئازارەیش ، بەبیانووی ئەوەی گوایە ئەم خەڵکە جگەربژاوانە لەدژی ئەم حوکمە نارەوایە چەکیان هەڵگرتوەو سوریشن لەسەر رێرەوی خەباتو



# پاشه ڕۆژی ڕژێمی فارسی .. !

قوربانیدانو نەسرەوتن ، تارۆژی سەرکەوتنو رزگاری .

بەڵێ : ئەمرۆ گەلانی بەشەرەفی ئێران سێدارەیان بۆ دائەنرێ . . گوندیان بوردومانو چۆڵ ئەکرێ ، رۆڵەکانیان یا ئەکوژرێنو یا کۆتوبەند ئەکرێنو یا ئەخرێنە ناو تاریکستانی زیندانەکانو یا دەستە دەستە بۆ بەرەکانی جەنگ ئەنێردێن . . بەچەشنێ کاز گەیشتۆتە رادەیەك ، مێردمندالآنو هەرزەکارانو تازە خەتی سمێل داناوان دەسرێژ ئەکرێن . .

بەم چەشنە ، زنجیرەی خەڵك لەناوبردنو موحاکەمەی رۆڵەتبازانە بەردەوامەو رۆژ تا دوای رۆژ تاوو جۆش ئەسێنێو شیرگیرژ ئەبێ . . بەجۆرێ کار گەیشتە ئەوەی یەکێکی وەك ئاغای رەفسنجانی دۆودۆشاو تێکەڵوپێکەڵ بکاتو بڵێ :

« هەرکەسێ ورتەی لێوەبێ ، ئیعدام ئەکرێو ئەکوژرێ . . » بەبیانووی ئەوەی گوایە پاسەوانی لەکۆمارە نازدارەکەی ئیسلامەتی ئەکرێ . . بەلآم چ ئیسلامەتیەك ، مەگەر هەر دوژمنانی راستەقانی ئیسلامەکانی قومو تاران پیێی بزاننو (فتوای) لەسەر بدەن . . بەلآم چۆن فتوایەك ... ؟

بەڵێ : ئەمە وێنەیەکی هەرەبچووکی گەلانی ئێرانە . . گەلانی دەسوەشێنی ئێران ، گەلانی کۆڵنەدەری ئێران . .

هەرئەمەیش وێنەیەکی بچووکی



کەی ، ئەو حوکمە نارەوایەیە ، کە ڕۆژی ئەمڕۆ لەئێرانا دەستاری حوکم‌و مێزەر ئەگێڕێ‌و مەرگ‌ئەچێنێ‌و ماڵوێرانی دابەش ئەکات‌و . . . تاد . . !

کێ ئەی کەواتە : وەك وترا ، بنەڕەتی ڕەوشتی ڕۆژانەو هەڵسوکەوتی بۆرەپیاوانی خومەینی ، لەچیەوە هەڵقوڵاوە ، لەترس‌ولەرز ، یا لەقەلاچۆکردنی هێزە دلێرەکانەوە ؟ پرسیارەو ئەکرێ‌و ئەشێ بکرێ ؟ بۆ نموونەو بەس · بەرلەماوەیەك گەلێ بڕیارو ڕاسپاردەی سەیرسەیر لەم حوکمە ڕەزاقورسەوە دەرچوو تیایا داوای لەخەڵك‌وخوا کردوە ، نزیکی ئەو شەقام‌و خیابان‌و کوچەو کۆلانانە نەبن ، کەماڵی ئاوەدانی پیاوانی حکومەتی بەدادی ئیسلامەتی تێدا جی‌نشینە . .

هەروا ماتۆرو ئۆتۆمۆبیلی تیژڕەو لەو شەقامانەدا لەخەڵك قەدەغەکراوە . . بەشێوەیەك ، مەسەلەی قەدەغەو قەدەغەکاری ، بوە بە رواڵەتی ڕۆژانەی خەڵك‌و ئەم حوکمە سەیرە . . ! !

لەسوچێکی ترەوە ، ترس‌ولەرز ، وای لەو بۆرە پیاوانەی حوکم کردوە ، کە بەجلوبەرگی مولکی‌یەوە ، یا بەریش‌و سمێڵ تاشینەوە ، هاتوچۆی ئەو ڕێگاو شەقامانە بکەن . . ئێ بەڵکو ئەمە خوایە ، لەدەس فیداکارانی ئێران ڕزگاریان بێت‌و بەرگوللەی حەق نەکەون . . ! نەك هەرئەمەو بەس ، بەڵکو کار گەیشتۆتە ڕادەیەك ئەو



نیمچەپیاوانە ، لەکاتی نوێژکردنیشا خۆیان لەخەڵك ئەشارنەوە ، لەترسی ئەوەی نەوەك بەر گوللەی تـــۆڵەی هـەقبـەدەستی هێزی نیشتمانی بکەون . . . ! ترس‌و لەرزیش گەیشتۆتە پلەیەك ، هەموو مۆنەکەکانی ئەم رژێمە ، زاڵەترەك بن‌و وێنەی رەجانی‌و باهونەر ، هەمیشە بێتە بەر دیدەی خەیاڵیال‌و خەوو خۆراکیان لێ حەرام بکات‌و ماسولکەو دەماری سری مارانەیان ، بێ‌هێزو دڵیان بتۆقێنێ . . ها ئێستا ، ها دەمێکی تر . . لەناکاو ، لەپڕێکا ، گوللەیەك ، لـــەغـــەمـێك ، نـــارنجۆکـێك ، تەقیەوە . . !

بەڵێ : بارو دۆخی ، وێنەی جیاجیای ئەم ترس‌و لەرزو جگەرپسانە ، هەموو لایەکی داگرتوە ، هیچ کەسێك لەو بورەپیاوانەی کە حوکمی قەرەقوشانە ئەگێڕن ، لەم هەستە بەدەرنین . . . هەر بۆیەشە شێتگیرانە ، دڕندانە ، کوێرانەو نامرۆڤانە ، روویان لەگرتن‌و بردن کردوە ، روویان لەتوقاندن‌و سێدارەو خنکاندن‌و دەسرێژی ناپیاوانە کردوە . . لەهەمان کاتا روویان لەهەڵدێری هەزار بەهەزار کردوە ، چونکە هیچ هێزێ نیە رێ خواستی گەلان بەربەست بکات‌و ماف‌و چارەنووسی رەوای پێشێل بکات : . !

ئێمە چاوەنۆڕین‌و ئەوان چاوەنۆڕ . . رۆژ ئەڕواو رۆژانیش رۆژی لەدوایە . . ! !

«رۆشنبیری نوێ»

# پێداچوونەوەیەکی هەندێ بە

## زمانەوانیی مامۆستا مەسعوود محەم

لە ژمارە (٧٢ ، ٧٣ ، ٧٤ ، ٧٥ ، ٧٦) ی ساڵی ١٩٧٩ی گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» دا زنجیرە وتارێکم بە ناوی «با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین»ەوە بڵاوکردبووەوە ، کە وەڵام بوون بۆ وتاری «سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد»ی د . جەمال نەبەز ، کە لە ژمارە (٢٢)ی ساڵی ١٩٧٨ی «گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات» دا چاپکرابوو . . لە بەشی پێنجەمی ئەو وتارەوە [1] مامۆستا مەسعوود محەمەد دوو خاڵی وەرگرتووە و لە وتاری «ڕەواندنەوەی دوو ڕەخنە»دا لێیان دواوە و ڕای خۆی دەربارەیان نیشانداوە . [2]

• خاڵی یەکەم لەبارەی وشەی «انعدام»ی عەرەبییەوە هاتووە ، کە گوایا کاتی خۆی ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کورد وشەی «نەمان»ی بۆ پێشنیار کردووە . .

د . نەبەز لە وتارەکەیدا ئەوەی کۆڕ ڕەتدەکاتەوە و وشەی «نەبوونی» بە لەبارتر دەزانێ . . منیش هەرچەندە لایەنگیری ئەوە بووم کە «نەمان» بەرانبەر «انعدام» تەواو نەوەستێ ، بەڵام لە هەمان کاتدا وشەی «نەبوونی» یشم کە د . نەبەز پێشنیاری کردووە ، بە لاوە پەسەند نەبووەو لە وەڵامەکەیدا وتوومە :

«ئەویش هەر ڕاست نییە ، چونکە

# سەروڕای بەڵگەیەکەم

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

وەك ئاشكرایە (نەبوونی) — (فقر، عوز)ە، نەك (انعدام)» (ڕۆشنبیری نوێ، ژ ٧٦، ل ١١).

مامۆستا مەسعوود محەمەد لایەنی ڕای منی گرتووە، كە «نەبوونی» بەرانبەر «انعدام» ناوەستێو دەڵێ: «نەبوونی)یش هەر ئەو واتایەی (فقر، عوز)ی هەیە كە د. ئەورەحمان بۆی چووە» (ڕۆشنبیری نوێ، ژ ٨٠، ل ٢). مامۆستا مەسعوود سەرەڕای لایەنگیری لەو بەڵگەیەی من بۆ ڕەتكردنەوەی بۆ چوونەكەی د. نەبەز هێناومەتەوە، چەند بەڵگەیەكی دی زانستی پتەوی وای لە زانستی زمان و ڕێزمانی كوردییەوە هەڵهێنجاوە، كە هیچ گومانی لەدەستنەدانی وشەی «نەبوونی» بۆ «انعدام» نەهێشتووە.

جا لەبەر ئەوەی لەم ڕووەوە جیاوازییەكی زۆر لەنێوان ڕای هەردووكماندا نییەو كێشەی تاكە زاراوەیەكیش هێندە گرنگ نییە، درێژە بە وەڵامی ئەمە نادەم.

ئەوەی لە كۆتایی باسی یەكەم خاڵی وتاری «ڕەواندنەوەی دوو ڕەخنە) دا بمەوێ دەری بڕم، ئەو تێبینییەیە كە سەبارەت بە شێوەی نووسینەكەی هەمە. ئەویش ئەوەیە كە مامۆستا مەسعوود بە جۆرێك لەو كێشەیە دواوە، كە ئەگەر یەكێك لە هەمانكاتدا وتارەكەی د. نەبەزو منی لەبەر دەستدا نەبێ، بە باشی تێناگا لەكوێدا وەڵامی كێ دەداتەوە.

ه خاڵی دووەمی نووسینەکەی مامۆستا مەسعوود رەخنەیە لە د . نەبەزو من ، دەربارەی ئەوەی کە هەردووکمان لەو رایەداین لە چاوگی وەك «کردن»و «رستن» دا (د) و (ت) پێش (ن)ی چاوگی ناکەون ، چونکە ئاشکرایە (ن)ی چاوگی هیچ کاتێك دەنگی کۆنسۆنانتی ناکەوێتە پێشەوەو رواڵەتی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی‌و نەبوونی وێنەی (أ) تێدا ، بووەتە هۆی ئەوەی هەندێ لە نووسەران هەڵەی تێدا بکەن (رۆشنبیری نوێ ، ژ ٧٦ ، ل ١٤) — واتە د . نەبەزو نووسەری ئەم وتارە ، ئەوەی لە نێوان ئەو دوو دەنگە کۆنسۆنانتەدا هەیە ، بە کورتە بزوێنی (أ)ی تێ دەگەن . بەڵام هەرچی مامۆستا مەسعوودە بە (قورس‌کردن)ی دادەنێ .

لەبەر ئەوەی ئەم باسە کێشەیەکی گەورەی فۆنەتیك‌و رێنووسی کوردییەو هەروەها لەبەر ئەوەی لەم رووەوە بۆچوونی هەردوولامان زۆر لە یەك دوورن ، بۆیە بەتایبەتی گرنگی بە وەڵام‌و روونکردنەوەو لێکدانەوەی ئەم خاڵەی وتاری «رەواندنەوەی دوو رەخنە» دەدەم :

یەکێك لە گیروگرفتەکانی رێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ئەوەیە کە بۆ کورتە بزوێنی (أ) هیچ پیتێك دانەنراوە ، ئەمەش بووەتە هۆی بە هەڵەبردنی گەلێ لە روونا کبیرانی کوردو هەندێ لە نووسەرانی رێزمانی کوردی . زۆر بەرچاوم کەوتووە وا دراوەتە قەڵەم کە وشەی (پر ، دز ، من . .) لە دوو دەنگ پێکهاتوون . هەرچەندە رێنووسەکە لە رەچاو نەکردنی بزوێنی (أ)دا ناتەواوە ، بەڵام ئەوانەی لە باسی زمان دەدوێن نابێ تەنیا تەماشای رواڵەت‌و رووخساری نووسین بکەن . . جا بەداخەوە ئەو بزوێنە ئێجگار کورتە کە (الکسرة المختلسه)ی پێ دەڵێن لە رێنووسی کوریشدا نەك هەر نیگاری بۆ دانەنراوە ، بەڵکو باسیشی نەکراوەو ناویشی نەبراوە .

شایانی باسە مامۆستا تۆفیق وەهبی لە سەرەتای ژیانی زانستی‌یەوە هەستی بە بوونی ئەو کورتە بزوێنە کردووەو ساڵی ١٩٢٩ لە کتێبی «دەستووری زمانی کوردی» دا پیتی (ی)ی بۆ کردبووە نیگار . .[٣] بەڵام وێکچوونی شێوەی ئەم پیتە لەگەڵ پیتی (ی-أ) و هەروەها هەست‌نەکردنی زمانەوانانی کورد بە بوونی (أ) بووە هۆی بەجێ‌نەهاتنی چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتە .

لەم ساڵانەی دواییدا مامۆستا مەسعوود محەمەد لە چەند نووسینێکیدا دەربارەی (أ) دواوە . ئەوەی جێگەی موناقەشە بێ ، ئەوەیە کە نووسەر ئەو کورتە بزوێنەی بە هێز (ئەو «قورس‌کردن»ی پێ وتووە) داناوە . مامۆستا لە وتاری «فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ؟ » دا کاتێ لە تایبەتێتیی‌و سروشتی دەنگەکانی زمانی کوردیی‌و گونجانو نەگونجانیان لەگەڵ یەکتردا ، دەدوێ ، نووسیوێتی : «ئەم دەنگەی (ر) کە بە سکون دەکەوێتە پێش دەنگی (د) یشەوە هەر بەتەواوی دەوەستێندرێ و هیچ قورس‌کردنو ددان لێ گیزکردنێك قبوڵ ناکا . وشەکانی (مەرد ، مێرد ، گورد ، سارد ، بەرد ، کورد ، ورد ، گەرد ، وەرد . . هتاد) ئەوانیش هەموویان هەر لەبەر ئەم هۆیە یەك برگەن ، وشەی (هەڵگۆرد) کە بۆتە دوو برگە واتە (هەڵ – گۆرد) ئەگەر لەبەر ئەم تایبەتییەی دەنگی (ر) نەبا دەبوو بە سێ برگە واتە (هەڵ – گۆ – رد) . بۆ روونکردنەوە وشەی (هەڵگۆرد) هەردوو جۆری بە پیتی لاتینی دەنووسم ، لە جێگەی قورسی‌کردنیش نیشانەی (أ) دادەنێم (هەڵگۆرد)ی دوو برگەیی بە لاتینی وەها دەنووسرێ ،/.قم«×حنيّ‌الله هی سێ برگەییش وەهای لێ دێ :
(Hel-Go-Rid) . . «[٤] .

بەمەدا ئەوەمان بۆ روونبووەوە کە وشەی «هەڵگۆرد» لە دوو برگە پێکهاتووە ، بەڵام ئەگەر (أ) بخرێتە نێوان (ر) و (د)ەوە ئەوە وشەکە دەبێ بە سێ برگە . . واتە لێرەدا ، ئەم (أ)ە قورس‌کردن بێ (وەك رای مامۆستا مەسعوود محەمەد) یاخود پەیدابوونی بزوێنێکی دیکە بێ (وەك رای نووسەری ئەم وتارە) ، ئەوە برگەیەکی تر زیاد دەکا . جا ئەگەر بەتەواوی بچەسپێنرێ کە ئەوە قورس‌کردن بێ ، ئەوسا دەردەکەوێ کە قورس‌کردنیش دەتوانێ دەوری جیاکردنەوەی برگە ببینێ . بەڵام ئەوەی لە زانستی زماندا ئاشکرا بێ ، ئەوەیە کە لە برگەدا دەبێ دەنگی بزوێن هەبێ . جا هەر لەبەر ئەوەشە کە ژمارەی برگەکانی هەر وشەیەك ، هێندەی ژمارەی بزوێنەکانی ئەو وشەیە دەبێت . بۆ نموونە لە وشەی «گۆران»دا دوو بزوێن هەیەو ئەمەش بووە بە هۆی بوونی دوو برگە ، وەك (گۆ – ران) ، کەچی وشەی «گۆرانی» بریتی‌یە لە سێ برگە (گۆ – را – نی) ، چونکە سێ بزوێنی تێدایە . .[٥]

مامۆستا مەسعوود محەمەد دەربارەی هەمان باس لە وتاری «رووێنووسی کۆر» یشدا دەڵێ : «بۆ ئەوەی کە لە عەرەبیدا پێی‌دەوترێ (کسرة مختلسة) – من لە نووسینەکانی خۆمدا پێی‌دەڵێم – قورس‌کردن) ، بەشێکی زۆری وشەکانی کوردی ئەم قورس‌کردنەیان تێدایە کە غالبی رێك‌خەرانی ئەلفوبێی کوردی بە لاتینی پیتیان بۆ داناوە بێ‌ئەوە لەوە بکۆڵنەوە ئاخۆ

ئەو دەنگە بەشێکی پێکهێنەری وشەکەیە یاخود زەرورەتێکی فۆنەتیکییە کە دەربڕینی دەنگێ لە حاڵەتی تایبەتیدا داخوازی دەکات . بەنموونە ، تۆکە دەڵێی (گەنم) بە ناچاری قورسایی (کسرة مختلسة) دەخەیتە سەر دەنگی (ن) بۆ ئەوەی بتوانی تلفظی پێبکەیتو بەدوا ئەودا دەنگی (م)ەکەش دەربڕێت کە هەردووکیان لە وشەکەدا بزوێنی ئاشکرایان نییە ، بەڵام کە هاتی میمەکەت بزواندو گوتت (گەنمەکە) قورسایی سەر نوونەکە نامێنێتو بەتەواوی دەوەستێت . زەرورەتەکەش لەوەوە دێت کە دەنگی نوون بە وەستاوی تەواوەوە لە پێش دەنگی میمی وەستاوەوە نایەت»[٦]

لەم وتارەشدا مامۆستا مەسعود محەمەد هەر لەسەر ڕای پێشوویەتی و ئەوەی (کسرة مختلسة)ی پێدەڵێن ئەو بە هێزی داناوە . بۆ پتەوکردنی ئەم ڕایەشی وشەی «گەنم»ی بە نموونە هێناوەتەوەو دەڵێ لە کەرتی دووەمیدا بزوێن نییە . بۆ پێسەلماندنی نەبوونی بزوێنیش دەنگی (م)ی بزواندووەو شێوەی «گەنمەکە»ی هێناوەتەوە . . . وەك پێشتر ڕوونمکردەوە کەرت دەبێ بزوێنی تێدابێ . وشەی «گەنم» لە دوو کەرت (گە–نم ge-nim) پێکهاتووەو ئەوەی دوای (ن)ەکە بزوێنە ، نەك هێز . ڕاستە کە دەڵێین «گەنمەکە» ، ئەو بزوێنی نێوان (ن)و (م)ەکە نامێنێ ، بەڵام دەبێ بزانین هۆی ئەوەیە کەرتەکان گۆڕانیان بەسەردا دێتو دەبنە (گەن – مە – کە gen-me-ke) . دەبینین (گە – ge) کەرتی یەکەمی وشەی «گەنم»ە ، کەچی لە شێوەی «گەنمەکە»دا بووە بە (گەن – gen) .

بەپێی ئەو بۆچوونەی مامۆستا مەسعود محەمەد ، دەبێ نەك هەر لە وشەکانی «خر ، در ، دز ، پر ، من . . .» دا کە یەك بڕگەیین ، بەڵکو لە وشەی دوو بڕگەیی و سێ بڕگەیی وەك «کردن ، بردن ، خستن ، مردن ، پرشنگ ، جل‌شتن ، درزبردن . . .» و گەلێ دەستەواژەو ڕستەی وەك «بشمگرن ، کردمن ، گرم گرت ، جلم برد شتم ، من کرم گرت ، من لنگم بلند کرد ، من پرشنگم گرت . .»یشدا هەر بزوێن نەبێ . ئەگەر بێینە سەر ئەو باوەڕەش کە هێز دەوری جیاکردنەوەی بڕگە دەبینێ ، بەڵام چۆن ئەوە بسەلمێنین وشە بەتایبەتی وشەیەك کە لە بڕگەیەك پتر بێ ، لە پێکهاتنیدا دەنگی بزوێن نەبێ . ئەگەر ئەمەشمان سەلماند ، ئەی بۆ ئەوە وەڵامان چی بێ ، کە لە سەرلەبەری دەستەواژەیەك یان ڕستەیەکدا یەك بزوێن چییە نەبێ . . لە زانستی زماندا ئەوە ڕوونکراوەتەوە کە هەموو وشەیەکی تەواو[٧] چۆن دەنگی کۆنسۆنانتی هەیە هەروەها دەنگی بزوێنیشی هەیە . . جا ڕێك‌خەرانی ئەلفوبێی لاتینی وەنەبێ بێ‌لێکۆڵینەوە پیتی (أ) یان بۆ ئەو دەنگە دانابێ . لەگەڵ هەموو ئەوەشدا ئەو دیاردەیە کورتە بزوێن بێ یان هێز ، لەبەر ئەوەی دەوری جیاکردنەوەی بڕگە دەبینێ ، بۆ نووسین جیاوازی ناکاو پێویستی بە نیشانە هەیە . بە هەمەچەشن لە ئەلفوبێی عەرەبیشدا دەبێ نیگاری بۆ دابنرێ .

مامۆستا مەسعود محەمەد لە خاڵی دووەمی وتاری «ڕەواندنەوەی دوو ڕەخنە»شدا سەبارەت بە هەمان کێشە دواوەو هەوڵی‌داوە بە هەندێ بەڵگەی نوێ فراوانتر ئەو ڕایەی ڕوونبکاتەوە . . لە سەرەتای ئەم ڕەخنەیەدا نووسیویێتی دەڵێ : «با لەپێشەوە ئەوە بڵێم ، نووسینی لاتینیش‌وا دەبێ سەر لە نووسەرو لێکۆڵەرەوەی کورد دەشێوێنێت وەك کە دێتو لەبری (ئا ، ئو ، ئی . .) تەنها یەك پیت دەنووسێت کەچی هەر یەکەیان بریتییە لە دوو دەنگی سەربەخۆی تەواو و چ فەرقێك نییە لەنێوان (دا ، دۆ ، دی) و (ئا ، ئۆ ، ئی) لە ڕووی ژمارەی دەنگەکانیەوە ، نووسینی لاتینی کە بایەخی بە دەنگی (همزە) نەداوەو لەوەشدا سەهوێکی زلی کردوە ، کێشەی بۆ ئێمەش ناوەتەوە کە بەشێکی بەرچاوی لێکۆڵەرەوەی کورد بەشوێن هەنگاوی ئەو سەهوەدا دەڕۆن و دەمەتەقە لەسەر بایەخی دەنگی (همزە) هەڵدەستێنن و دانەنانی نیشانە بۆ هەمزە لە نووسینی کوردیدا بە ڕاست دەزانن کەچی دەنگێکی زیندە ڕەسەنو کۆنی زمانەکەمانە ، هەر ئەوەندە هەیە لە ئاخاوتنی ئێستاکەماندا هەمزە لەناو توێژی وشەدا نەماوەو بە زۆری لە بەرایی وشەوە دێت ، تەنها لە ڕێژەی موزاریع و ئەمر نەبێ ، وەك : دەئاخێوێ ، دەئەنجنێ ، بئاخێوە ، بئەنگێوە ، دەئەژموم . . لە کوردیدا دەنگی لامی قەڵەویش لە بەرایی وشەوە نایەت کەسیش ناڵێ با نیشانەی بۆ دانەنرێت» (ڕۆشنبیری نوێ ، ژ ٨٠ ، ل ٣) . بەر لەوەی بڕیار بدرێ کە هۆی بایەخ پێنەدانی لاتینی بە دەنگی هەمزە «سەهوێکی زل بێت» پێویست بە لێکۆڵینەوەی فۆنەتیکە ، بەتایبەتی لە دیاریکردنی تێکڕای فۆنێمەکانداو ئنجا دانانی نیگار بۆ هەر یەکێك لەو فۆنێمانە ، دوایش پێویستە ئەو پیتانە لەگەڵ یەکتردا بەراورد بکرێن ، تاکو بزانرێ بوونو نەبوونیان چ دەورێك دەبینێ .

وەك ئاشکرایە (دەنگ) لە ڕێگای ئەندامەکانی ئاخاوتنەوە دەردەبڕێت بەهۆی بیستنەوە هەستی پێ دەکرێ . (پیت) وێنەی دەنگە ، بە نیشانە لە نووسیندا دیارکراوە و بەهۆی بینینەوە

وەردەگیرێ . راستە مرۆڤ نەك تەنها دەتوانێ وشە بڵێ ، بەڵكو هەروەها دەتوانی بیشینووسێ ، یاخود چاپی بكات ، بەلأم کاتێ دەنووسین یاخود شت چاپ‌دەکەین ، ئەوسا وێنەی دەنگەکانی ئاخاوتن بە پیت نیشان دەدەین . بەڵێ زمان دوو دیوی هەیە : ئاخاوتن‌و نووسین . بەلأم ئاخاوتن رەسەنترەو پێش نووسین‌کەوتووە . منداڵ لە سەرەتادا فێری قسەکردن دەبێ‌و دوایی نووسین . زۆر کەسانیش هەن سەد ساڵ دەژین‌و رەوان‌و پاراو بە زمانەکەیان دەدوێن ، بێ‌ئەوەی فێری خوێندنەوە یان نووسینی پیتێك بووبن . لەم سەدەی بیستەمەشدا هێشتا میللەتی‌وا هەیە کە لەو دەستکەوتە مەزنەی شارستانی‌یەت بێ‌بەشە .

تا ئێرە کەمێ لە جیاوازی نێوان (دەنگ) و (پیت) دواین ، ئنجا دێینە سەر بەراوردکردنی (دەنگ) و (فۆنێم) . وەك ئاشکرایە ، فۆنێم بەو دەنگانە دەوترێ کە لە زماندا وشە پێك‌دەهێنن و بە گۆران‌و لاچوونیان . واتا دەگۆرێن . بۆنموونە ، ئەگەر فۆنێمی (ا) لە وشەی «باز»دا بگۆرێت بە (ە ، ۆ ، ێ . . .) ، ئەوە ئەم وشانە «بەز ، بۆز ، بێز . .» پەیدادەبن ، کە جیاوازیيەکی تەواو لە ماناياندا هەيە — واتە لێرەدا فۆنیمێ (ە ، ۆ ، ێ . .) دەوری گۆرینی مانای وشەی «باز» دەبینن . ئەگەر فۆنێمی (ز)یش لە وشەی «ناز» دا بگۆرێت بە (ن ، ڵ ، ف ، خ . . .) ، ئەوە ئەم وشانە : نان ، ناڵ ، ناف ، ناخ . .» دروست دەبن ، کە هەر یەکەيان مانای تايبەتی خۆی هەيە — واتە بەم جۆرە دەبينين کەوا فۆنێمی (ن ، ڵ ، ف ،خ . .) مانای وشەی «ناز» دەگۆرن . . لێرەدا پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین ، کە هەرچەندە فۆنێم کاری جیاکردنەوەی گۆرینی مانا بەجێ‌دەهێنێ ، بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا بەتەنیا خۆی خاوەنی مانان واتا نیيە .

(فۆنێم) لە (دەنگ) گرنگترە ، چونکە جیاوازی دەخاتە نێوان وشەوە . هەموو فۆنێمێك ، دەنگە ، بەلأم هەموو دەنگێك ، فۆنێم نیيە . بە وێنە : (قیژە ، هاوار ، قۆرەی سك ، قرقێنە ، نزگەرە ، پرخەپرخ ، کۆکە . . .)

هەموو دەنگن ، بەلأم هیچیان فۆنێم نین . یاخود کات (گ ، ك) لەپێش (ی ،ێ ، وێ ، وی)دا دەگوترێن ، شێوەی تەلەفوزیان وەك (چ)یان (ج)ی لێ دێت— واتە (گ) و(ك) لە حاڵەتی ئاسایيدا لەبنی ئەوکەوە تەلەفوز دەکرێن ، بەلأم لە حاڵەتی دووەمدا زمان نزیك مەلأشوو دەخاتەوە . بەو پێ‌یە دەبنە دەنگی جیاواز ، بەلأم نابنە فۆنێمی جیاواز . . . هەروەها لە زمانی کوردیدا همزە (ء) کە بەتايبەتی لە سەرەتای وشەوە بۆ ياريدەی دەربرينی دەنگە بزوێنەکان دێت ، دەنگە ، بەلأم فۆنێم نیيە . . .

ئێمە کە لە رێگەيەکی زانستییەوە سێ مەفهوومی (فۆنێم) و (دەنگ) و (پیت) مان جیاکردەوە ، ئەوە کارمان لە سازکردنی ئەلفوبێدا ئاسان دەبێت ، چونکە کە دەنگەکانی زمانی کوردیمان دیاری‌کرد ، ئەوسا دەزانین دەبێ نیگار بۆ چی بکێشین . بەوێنە کە بۆمان دەرکەوت (م ،ن ، ف ،ش ،پ . . .) فۆنێمی ، ئەوە تێ‌دەگەین کە پێویستیان بە پیتە . یاخود بەپێچەوانەوە ، کە زانیمان دەنگی (گ) لە وشەی «گەر» و «گێر»دا لەگەڵ جیاوازی شێوەی تەلەفوزکردنیشياندا ، هەر يەك فۆنێمن ، ئەوە ئەو هەڵەيە ناکەين ، کە وێنەی جیاوازیان بۆ دابنێین . . . لەبەر ئەوەی گومان لەوەدا نییە کە لە زمانی کوردیدا بزوێنی (و— U)ی کورت‌و (وو— )ی درێژ دوو فۆنێمن ، بۆیە دەبێ هەریەکەیان وێنەی خۆی هەبێ . . . ئەگەر لێکۆڵینەوە ئەوە بسەلمێنێ کە (ی) کورت‌و تیژیش وەك فۆنێمی سەربەخۆ خۆیان دەنوێنن ، ئەوە پێویستە نیگاری جیاوازیان بۆ بکێشرێ . بەلأم ئەگەر روون‌کرايەوە ، کورت‌و درێژی وتنی ئەو دەنگە هۆی بوون‌و نەبوونی هێز بێ‌و دەوری واتاگۆری نەبینێ ، ئەودەم جیاکردنەوەی وێنەيان شتێکی راست نییە . . .

بێتوو ساغ‌بکرێتەوە کە هەمزە(ء) فۆنێم نییە ، ئەوە هیچ پێویست بەوە ناکات پیتی بۆ دابنرێت ، خۆ ئەگەر چەسپێزا کە فۆنێمە ، دەبێ لە ئەلفوبێدا وێنەی بۆ بکێشرێ . . . بە رای ئێمە لە زمانی کوردیدا (ء) فۆنێم نیيە ، بەڵکو دەنگێکی ياريدەدەرەو لە سەرەتای ئەو وشانەوە ياخود ئەو برگانەوە پەيدادەبێ کە بە بزوێن دەست‌پێ‌دەکەن . سەرەرای ئەوەی تێ‌چوونی هەمزە لە وشەی لێکدراوی کوردی ، وەك : «گوڵ + ئاو = گوڵاو ، ماست + ئاو = ماستاو ، زەرد + ئاو = زەرداو ، سەر + ئێش + ە = سەريەشە . . .» و بوونی هەمزە بە بزوێن لەو وشانەدا کە لە زمانی عەرەبی‌یەوە وەرگيراون ، وەك : «دائم — دايم ، دائرة — دايەرە ، مسئلە — مەسەلە ، بئر — بیر . . .» و بەکارنەهێنانی لە ناوەراست‌و کۆتايی[٨] وشەدا . . . ئەوە دەسەلمێنن کە هەمزە فۆنێم نەبێ‌و دەنگێکی ياريدەدەر بێ .

جا بەلای منەوە نووسینی لاتینی کە بايەخی بە دەنگی هەمزە نەداوە مەسەلەکە سەهوکردن نییە ، بەڵكو ئەوەیە کە هەمزە (دەنگ)ە و (فۆنێم) نییە ،وەك پێشتریش

ڕوونمان‌کردەوە ، هەموو دەنگێك فۆنێم نییەو نیشانەش بۆ ئەو دەنگانە دادەنرێن ، کە فۆنێم بن . . . ئەو وشانەش : (دەئاخێوی) دەئەنجنیٚ ، بئاخێوە ، بئەنگێوە ، دەتئەزموم . . .) کە دەنگی هەمزەیان تێدایەو مامۆستا مەسعوود بۆ پتەوکردنی بۆچوونەکەی هێناونیەوە ، بەئاشکرا تێیاندا دەردەکەویٚ کە پێویستی فۆنەتیکی ئەو هەمزەیەی هێناوەتە کایەوە ، کە ئەوەش پێکهاتنی وشەکان سازیان کردووە ، چونکە ئەگەر ئەو نیشانانەی لەپێش وشەکانەوە هاتوون بە بزوێن دەست‌پی‌ٚدەکەن .

سەرەڕای ئەوە ، جگە لە دوا وشە (دەتئەزموم) ، هەموو ئەوانی دی (دەئاخێویٚ ، دەئەنجنیٚ ، بئاخێوە ، بئەنگێوە برگەی یەکەمی ئەو ڕێژانە بە بزوێن کۆتاییان هاتووە ، بۆیە بۆ ئاسانکردنی دەربڕینیان (ء) هاتۆتە پێشەوە .

بەوێنە لە وشەکانی «دەئاخێویٚ ، دەئەنجنیٚ»دا برگەی یەکەم – واتە (ە) کە نیشانەی کرداری ئێستایە– بە بزوێن کۆتایی دێت‌و سەرەتای ڕەگی وشەکانیش بە بزوێن . . . لە وشەکانی «بئاخێوە ، بئەنگێوە» دیسان برگەی یەکەم– واتە (ب– bi)[9] کە نیشانەی فەرمانە – بە بزوێن کۆتایی دێت‌و سەرەتای ڕەگی وشەکانیش بە بزوێن . . . دوا نموونەش «دەتئەزموم» وەك دوو وشە خۆی دەنوێنیٚ ، چونکە جیٚناوی (ت) کە چووەتە سەر نیشانەی (دە) بووەتە وشەیەك‌و ئەوی دەمێنێتەوە (ئەنگێوم)ە . . .

بەو پێیە دەرکەوت کە هۆی بوونی هەمزە لەو نموونانەدا ئەوە نییە کە مامۆستا مەسعوود بۆی چووە– واتە دەنگێکی واتاداری ڕەسەن– نییە ، بەڵکو دەنگێکی یاریدەدەرە لە سەرەتای ئەو وشانەوە یاخود ئەو برگانەوە پەیدا دەبیٚ کە بزوێن دەست‌پی‌ٚدەکەن .

بەڵگەیەکی‌دی مامۆستا مەسعوود محەمەد بۆ پێویستی بوونی پیتی هەمزە لە ئەلفوبێی لاتینیدا ، ئەوەیە کە دەڵیٚ : «لە کوردیدا دەنگی لامی قەڵەویش لە بەرایی وشەوە نایەت کەسیش ناڵیٚ با نیشانەی بۆ دانەنرێت «ڕۆشنبیری نویٚ ، ژ ٨٠ ، ل ٣» . . . بە ڕای من ئەم بەڵگەیەش لەبار نییەو جیاوازی لەنێوان ئەو دوو دەنگەدا– واتە (ء) و (ڵ)– زۆرە ، ئەویش چونکە ، وەك وتمان (ء) لە کوردیدا فۆنێم نییە ، بەلاٚم (ڵ) فۆنێمە ، بۆ نموونە ئەگەر فۆنێمی (ل) لە وشەی «پەلە ، کەل . . . »دا بگۆڕێت بە (ڵ) ، ئەوە دەبن بە «پەڵە ، کەڵ . . .» کە جیاوازییەکی تەواو لە مانایاندا هەیە– واتە لێرەدا گومان لەوەدا نییە کە (ڵ)و (ل) دوو فۆنێمن . . .

هەروەها ئەو بەڵگانەی پێشتر بۆ گومان‌کردن لەوەی هەمزە دەنگێکی واتادار بیٚ هێناومانەتەوە ، وەك : هاتنی تەنیا لەپێش بزوێنەوەو تی‌ٚچوونی لە وشەی لێکدراوداو بوونی بە بزوێن لەو وشانەدا کە لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراون . . . ، بەنیسبەت دەنگی (ڵ)ەوە بەپێچەوانەوەیە – واتە بەشێوەی جۆربەجۆر لە ناوەڕاست‌و کۆتایی وشەدا زۆر بەکاردێت‌و لە وشەی لێکدراودا تی‌ٚناچی‌ٚو تەنانەت دەنگی (ل)ی هەندیٚ وشەی عەرەبی وەرگیراویش لە کوردیدا بووە بە (ڵ) .

جا کە ئەو هەموو جیاوازییە لەنێوان ئەو دوو دەنگە– واتە (ء)و (ڵ)–دا هەبی ، بەراوردکردنیان بەڵگەیەکی لەبار نییە . یاخود کە گومان لەوەدا نەبیٚ ، لە زمانی کوردیدا (ڵ) فۆنێم بیٚ ، ئیتر بۆ کەس داوای ئەوە بکات نیشانەی بۆ دانەنرێت .

**– ماوێتی –**

**پەراوێزەکان :**

١ – لەبارەی وتاری (با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین)ەوە دەمەویٚ سەرنجی خوێنەر ڕابکێشم‌کە لە کاتی نووسینەوەی بەشی دووەمدا هەڵەیەك کراوە ، ئەویش ئەوەیە بەیتی (برینی گامێشی– بەردان دەقەلێشی کەوتۆە ناو ئەو نموونانەوە کە کراونەتە بەڵگەی نیشاندانی جنسی نێر لە ناوچەی سۆران (بڕوانە : ڕۆشنبیری نویٚ ، ژ ٧٣ ، ل ٢٤) .

٢ – مەسعوود محەمەد ، ڕەواندنەوەی دوو ڕەخنە ، گۆڤاری «ڕۆشنبیری نویٚ» ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ژ ٨٠ ، ل ٢–٨ .

٣ – تەوفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەمی ، بغدا ، ١٩٢٩ .

٤ – مەسعوود محەمەد ، فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ؟ «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ل ٥٩١ .

٥ – بۆ زانستی زیاتر لەم‌بارەوە ، بڕوانە : د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٦٧–٦٩ .

٦ – مەسعوود محەمەد ، ڕێنووسی کۆڕ ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ب ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٥٢٣– ٢٥٤ .

٧ – بۆیە وتوومانە وشەی تەواو ، چونکە هەندیٚ وشەی ناتەواو بەوچەشنە نین .

٨ – لە زمانی کوردیدا هەمزە لە کۆتایی وشەدا تەنیا لە وشەی «نەء»دا دەبینرێت ، کە ئەویش بە زۆری دەکریٚ بە «نا»

٩ – وشەکانی «بئاخێوە ، بئەنگێوە» بەڵگەیەکی باشن بۆ وەرگرتنی ئەو ڕایە ئەوەی دوای (ب) دێت کورتە بزوێنە نەك قورس‌کردن . چونکە ئەگەر لەوشوێنەدا ئەو بزوێنە نەبوایە ، ئەوسا هەمزە نەئەهاتە کایەوە .

# فەلسەفەی سپەیس و کات لە تیۆری نسبیەدا

ئامادەکردنی : زیرەك کمال احمد

گومانی تیانیە کە سەدەی بیستەم لە مێژووی مرۆڤدا سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشێکی فیکریو تەکنۆلۆژیو . . . هتد بەخۆیەوە بینی .

چەندەها تیۆری زانستیو کۆمەلاّیەتیو رامیاریو . . . هتد وەك پێویستیەکی قۆناغ هەر لەو سەردەمەدا سەریان هەلّدا . یەکێك لەم تیۆرانە تیۆری (نسبیە)ی (ئەنشتاین)ە کە لە راستیدا شۆڕشێکی فیکری دەربارەی تێڕوانینە کلاسیەکان بۆ گەلێ رووداودو حەقیقەت بەرپاکرد .

لێرەدا وەکو پێویستیەك دەمەوێ بیرۆکەیەك پێشکەش بە خوێنەری کوردی ئەمرۆمان بکەم دەربارەی ئەم باسەو هەمەکیکردنە (تعقیم) فەلسەفیەکانی کاتێ کە بەراوردی دەکەین لەگەل هەردوو تەزودە فەلسەفیە نبەرەتیەکان (ماتیریالّیو ئایدیالّی) . چونکە لەراستیدا تاکو ئێستاش هیچ باسێك یا لێکۆلّینەوەیەك دەربارەی ئەم فەسەلەیە بە زمانی کوردی نەنووسراوەو وەرنەگێر دراوەتە سەر زمانی کوردی .

تیۆری نسبیە . بەشێوەیەکی سەرەکی . وەك لەم باسەدا دەمەوێ تیشکی بخەمە سەر باسی سپەیسو کات دەکات .

لە سەرەتای باسەکەدا تێڕوانی کلاسیکیەکانم بۆ سپەیسو کات روونکردۆتەوە . ئینجا تێڕوانینی تیۆری نسبیە بۆ هەمان شتو پەیوەندی سپەیسو کات بە ماتیریالّەوە لە تیۆری نسبیەدا . هەروەها باسێکی مێژوویی سپەیسو کاتم کردووە لە فەلسەفەداو تێڕوانینی هەردوو

تەزووە فەلسەفیە بنەرەتیەکانم دەربارەی سپەیس و کات روونکردۆتەوە . لە زۆر شوێنیش دا دەق ووتەی فەیلەسووفەکانم نووسیوەتەوە بۆ روونکردنەوەی باسەکە .

هیواشم وایە کە ئەم باسە ببێت بە دەرگایەکی کراوە بۆ دەربڕینی لێکۆڵینەوەی زانستیانە بە زمانی کوردی بۆ ئەوەی لەم بوارەش دا وەك هەموو لایەنێکی فیکری . . خوێندەواری کورد سوود وەربگرێت .

تیۆری نسبیە تیۆرێکی فیزیکی یە دەربارەی سپەیس و کات واتە (الفضاء والزمان) ، بۆیە بە پێویست دەزانرێ کە لە خەواسە فیزیکیەکانی سپەیس و کات بکۆڵرێتەوە وەك بیرێکی فەلسەفی و ئەنجامەکانی هەمەکی بکرێ . سپەیس وەکو پێناسەیەك کۆمەڵێ خاڵی بەیەك گەیشتووی پێکەوە بەستراو و لەیەك نەپچڕاون کە دەتوانین وەك (متصل) سەیری بکەین و شوێنی هەر خاڵێك بەهۆی سێ دووری یەوە (احداثی) $X, Y, Z$ دەستنیشان دەکرێت .

چونکە بۆ هەر خاڵێك ژمارەیەکی بێسنوور لە خاڵی هاوسێ هەیە کە دەتوانرێ تا رادەیەکی زۆر لێی نزیك بکرێتەوە .

زۆر جار کە لە مەفهوومی سپەیس ئەکۆڵینەوە سپەیسی فیزیکی و زۆر لە سپەیسە ماتماتیکی یەکانمان لێ تیکەڵ دەبێ کە لە فیزیکی نوێ (الفیزیاء الحدیثە) بەکارهێنانیان زۆرە بۆ نموونە (فضاء الطور) (Phase Space) – کە لە فیزیکی ئامار (احصاء) و ثیرمۆدانامیك ، وسپەیسی هەلبەرت کە لە میکانیکی کوانتەم و سپەیسی ئایزۆتۆپی کە لە فیزیکی ناوکی وبەکاردەهێنرێن و چەندەهای تریش .

**سپەیس و کات لە میکانیکی کلاسیکی**

رووداو (الحادثە) لە میکانیکی کلاسیکی بەهۆی چوار دووری یەوە دیاری دەکرێت . سێ دووریان سپەیسین و چوارەمیشیان کاتە . جا بۆیە جیهانی فیزیکی کە رووداویکی کلاسیکی تیادا دەدا وەك حاڵەتێکی چوار دووری سەیری دەکرێت . دەتوانین چەند بەراوردیکی ئەم حاڵەتە چوار دووریەی میکانیکی کلاسیکی بکەین لەگەڵ هەمان حاڵەتی چوار دووری کە لە تیۆری نسبیەدا هەیە . بەم شێوەیەی خوارەوە .

لە میکانیکی کلاسیکی دا حاڵەتە چوارینیەکە واتە (متصل)ەکە ئەبێ بە دوو بەشەوە یەکێکیان سپەیسێکی سێ دووری و ئەوی تریشیان کاتێکی تاکە دووریە . ئەمەش شتێکی گونجاوبوو چونکە کات وەکو حاڵەتێکی سەربەخۆ سەیری دەکرا . واتە پشت نابەستێ بە شوێن و جووڵەی سەرچاوە . کە وەستاو بێت یاخود بەخێراییەکی نەگۆڕ بجوولێتەوە لەسەر هێلیکی راست .

لە کاتی گوێزانەوە لە سەرچاوەیەکی سەرەتاییەوە (مرجع قصوری) (inertial system) بۆ یەکێکی تر تەنها هاوکێشەکانی گالیلۆ بەسن بۆ گوێزانەوەکە . لێرەدا کات لە هەردوو سەرچاوە یەکسانن و بە یەکسانی دەپێورێن . واتە $(t = t')$ .

کە $t$ ئەو کاتەیە لە یەکێ لەو سەرچاوانە دەپێورێ .

$t'$ ئەو کاتەیە کە لە سەرچاوەکەی تر دەپێورێ . لە ئەنجامی تێڕوانینی میکانیکی کلاسیکی دەگەینە ئەوەی کە رووداوی دوو رووداو لە یەك کاتداو لە یەك سەرچاوەوە ئەوە دەگەینێ کە هەمان دوو رووداو لە هەموو سەرچاوەکانی تردا لە یەك کات دا روودەدەن . واتە لێرەدا جۆری سەرچاوەکە (چۆنێتی جووڵەی) هیچ رۆڵێك نابینێ .

**سپەیس و کات لە نسبیەی تایبەتی دا :**

کات لە نسبیەی تایبەتی هیچ شێوەیەکی رەهایی (مطلق) وەرنەگرتووە واتە جیا ناکرێتەوە لە سەرچاوەکەی خۆی و پەیوەندیەکی پتەوی پێوە هەیە . بە هەمان شێوەش سپەیس هیچ شێوەیەکی رەهایی وەرنەگرتووە . بەم جۆرە نسبیە مەفهومی سپەیسی رەهایی لە فیزیك لابرد هەروەك چۆن ئەڵێن کە مەفهوومی ئەثیری لە فەرهەنگی فیزیك دا نەهێشت .

بەپێی ئەم تیۆرە کاتێ لە سەرچاوەیەکی سەرەتاییەوە ئەگوێزیتەوە بۆ سەرچاوەیەکی تر تەنها گۆڕان لە سپەیس دا نابێ بەڵکو کاتیش دەگۆڕێ واتە $(t \neq t')$ . لێرەدا هاوکێشەکانی لورنتز بەکاردێن بۆ گوێزانەوە . ئەم هاوکێشانە بیرۆکەیەك دەربارەی بەیەکەوە بەستنی سپەیس و کات دەدەن . ئەمەش زیاتر روون دەبێتەوە کاتێ کە سەیری هاوکێشەی تایبەت بە کات دەکەین :

$$t' = \frac{t - vx/c^2}{\sqrt{1 - \frac{v^2}{c^2}}}$$

$t$ : کاتە لە سیستەمە وەستاوەکە

$t'$ : کاتە لە سیستەمە جوولاوەکە کە بە خێراییەکی نەگۆڕ $(v)$ دەجوولێتەوە بەگوێرەی سیستەمە وەستاوەکە .

$X$ **دووری براوە لە لایەن سیستەمە جوولاوەکەوە**

$C$ **خێرایی رووناکیە = ٣×١٠^٨ م/چرکە** .

**جیهانی منکومنسکی چواریی :**

منکومنسکی (Minkowski) ئەم حاڵەتە (متصل) [سپەیس – کات] بە

چوارینیەی کە ڕووداوی فیزیکی تیا ڕوودەدات ناونا (جیهان) ێك و هەر ڕووداوێك کە لە یەکێ لە خاڵەکانیا ڕوودەدا پێی دەووترێ «خاڵی جیهان و ئەم خاڵەش جووتە لەگەڵ خاڵێك لە سپەیسێکی سێ دووری‌و کاتێکی تاکە دووری ، زانای ناوبراو وای پێشنیارکرد کە ئەندازەی ئەم جیهانە چوار دووریە لە ئەندازەی ئیقلیدی سپەیسی سێ دووری ئەچێ . جیهانی منکومنسکی گونجاوە (منسجم) (Homogenous) و ئایزۆتۆپیشە (متناظر) واتە هەموو خالیکی لە خاڵەکانی تری دەچی‌و هەموو ئاراستەیەك هاوتای ئاراستەکەی ترە . گونجاو‌و ئایزۆتۆپی دوو سیفاتی هاوتاین (حفات تناظریە) پەیوەندیەکی پتەویان بە یاساکانی پاراستنەوە (قوانین الحفظ) هەیە . لە هاوتایی (سپەیس - کات)ی فیزیکی ئەم یاسایانەی پاراستن دێنەکایەوەو هەموو یاسایەکی پاراستن پی‌ویستی بە جۆرێك لە هاوتایی هەیە .

پاراستنی تەووژم (الزخم) گونجانی سپەیس دەگەیەنێ ، و پاراستنی ووزەش گونجانی کات دەگەیەنێ . لە نسبیەی تایبەتی‌دا ئەم دوو یاسایەی پاراستن لە یەك یاسا یەك دەگرن ئەویش یاسای پاراستنی ڤیکتۆری ووزە - تەووژم (قانون حفظ فکتور الطاقە - الزخم) هەر لەم یاسایەشەوە بیرۆکەی گونجانی سپەیس - کات وەکو ئەنجامێکی حەتمی خۆی دەردەخا .

**سپەیس‌و کات‌و ماتیریاڵ لە تیۆری نسبیەی تایبەتی :**

دۆزینەوەی پەیوەندی لەنێوان حاڵەتە چوارینیەکەی کە باسمان کرد لەگەڵ ماتیریاڵ گرنگیەکی زۆری هەیە . ئەنشتاین لەم بارەیەوە دەڵێ :

[لەم بوارەدا نسبیەی تایبەتی لەگەڵ میکانیکی کلاسیکی ڕێك دەکەوێت ، بەجووتە ئەم سیفەتانەی خوارەوە ئەدەنە پاڵ سپەیس : سپەیسی واقیعی فیزیکی واتە لەگەڵ کاتی تایبەت بە خۆی - بە شێوەیەکی سەربەخۆ هەیە بە جیا لە ماتیریاڵ ، بێ مەرج دانان ، هەروەها هەڵگری ماتیریاڵ‌و کایەکەشیەتی (حامل المادە والمجال) هەروەها ئەنشتاین لە هەمان باس‌دا نووسیویەتی :

سپەیس لە نسبیەتی تایبەتی ، هەروەکو لە میکانیکی کلاسیکی ، یەکێکە لە پێکنەرە سەربەخۆکان لە وێنەکێشانی «تصویر» واقیعی فیزیکی ، سپەیسی (قصوری) ئەمێنێتەوە هەتا ئەگەر ماتیریاڵ‌و کایەکەشی لێ لابرێ] .

جا لێرەدا ئەم پێکنەرە چوار دووریەی جیهانی منکوفسکی سەیری دەکرێت وەکو هەڵگری ماتیریاڵ‌و کایە .

ئەوەی شایانی باسە لێرەدا ئەوەیە کە تێڕوانینی ئەنشتاین بۆ کایە لە تێڕوانینی ماتیریاڵیەکان نزیك‌دەبێتەوە ، واتە بە لەقەڵەم دانی کایە بە جۆرێك لە جۆرەکانی ماتیریاڵ .

هەر لەم بارەشەوە نووسیویەتی :

[کایە لێرەدا بووە بە توخمێکی بنەڕەتی‌و ناتوانرێ کورت‌بکرێتەوە لە توخمەکانی وەسفی فیزیکی بە هەمان مەفهومی ماتیریاڵ لە تیۆری نیوتن] .

«باسێکی مێژوویی سپەیس‌و کات لە فەلسەفە»

زانا ئەتۆمیە یۆنانیەکان هەوڵیان دا لە سیفەتەکانی سپەیس بگەن کاتێ لەگەڵ سیفەتەکانی ماتیریاڵ‌و جوولانەوەکانی بەراورد بکرێت . باوەڕکردن بە بوونی ئەتۆم لەلایەن ماتیریاڵیەکانەوە بوونی سپەیسێکی بەتاڵ بەیەکێ لە مەرجەکان دائەنێ‌و ئەمەش وای لە دیمقریط کردووە کە بڵێ :

**«لە گەردوون هیچ شتێك نیە تەنها ئەتۆم‌و بۆشایی نەبێت»**

بەڵام ئەرستۆ بە پێچەوانەی ئەم ڕایەوە بیری دەکردەوەو بۆ ئەوە چوو کە دابەش‌کردنی ماتیریاڵ لە ئاستێکی دیاریکراو ناوەستی‌و توانای مایتریاڵ بۆ دابەش‌کردنی بێ‌کۆتاییە ، جا بۆیە ماتیریاڵ - بە گوێرەی ئەرستۆ - ، نەپچڕاوە ، بەم جۆرە لە دژی بیرۆکەی سپەیسی بەتاڵ وەستا . ئەمەش زیاتر لە ووتەکەی ڕوون دەبێتەوە :

**(سروشت ڕکی لە بۆشایی دەبێتەوە)** .

میکانیکی کلاسیکی بەشێوەیەکی سەرەکی متمانەی کردە سەر تێڕوانینی ئەتۆمیەکان دەربارەی ماتیریاڵ‌و بۆشایی وە ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی بیرۆکەی (کارتێکردن لە دوورەوە ، Action at a distance) کە بیرۆکەی یەکتر ڕاکێشانی دوو ماتیریاڵی لەسەر دەوەستێ لە سپەیسی‌دا بەبێ بوونی ناوەندێکی ماتیریاڵیێ فیزیکی لە نێوانیاندا ، بەڵام جوولانەوەی ماتیریاڵ لە سپەیس - کات‌دا و دانرا کە ڕەها (مطلق) بێ ، واتە کاری تێ ناکرێ لەلایەن سپەیس‌و کات هەروەها کاریش ناکاتە سەریان .

فارادای‌و ماکسویل بوونی سپەیسی بەتاڵیان بە شتێکی ڕاست نەزانی‌و ووتیان کارتێکردن (Action) لە نێوان دوو ماتیریاڵی لێك دوور بەهۆی کایەوە ڕوودەدات‌و ئەمەش پێی دەووترێ [ کارتێکردن لە نزیکەوە - مبدأ الفعل عن

قوب]. کایەش واقیعێکی فیزیکی سەربەخۆیە و ناتوانرێ کەم بکرێتەوە بۆ چەند تەنۆلکەیەکی کلاسیکی. لەگەڵ ئەوەشا سپەیس و کات وەکو دوو شتی رەهەنی مانەوە تا هاتنی تیۆری نیسبەت. هەمەکی کردنە فەلسەفیەکان دەربارەی سپەیس و کات وەکو لە هەموو بسێك دابەش دەکرێن بۆ دوو بەشی دژ بە یەکتر. ئەمانیش ماتیریالی و ئایدیالین.

فەلسەفەی ئایدیالی واقیعی مەوزوعی سپەیس – کات بە راست دانانێت و بە بەرهەمی فیکریان دادەنێ، واتە دوو شتن لە هۆش هەن، لەم بارەیەوە فەیلەسووفی بەناوبانگ عەمانوئیل کانت دەڵێ:

**[سپەیس و کات ئەو بۆچوونە پێشوویانەن (تصورات قبلية) کە وەکو فۆرمێکی عەقڵی بە دوامانەوەن پێش ئەوەی ئەم بۆچوونە شتێکی حەقیقیمان بداتێ لە ڕێگای هەستەوە.**

**سپەیس مەفهومێکی تەجریبی نیە لە ئەنجامی ژیانی ڕۆژانەوە دەستمان بکەوێت. بەڵکو بۆچوونێکی پێویستی پێشوویە (قبلية) کە هەموو تێڕوانینە دەرەکیەکانمانی لەسەر وەستاوە، هەروەها کات فۆرمێکە بۆ عەقڵی ناوەکی، واتە سەیرکردنی خۆمان و حاڵەتی ناوەکیمان].**

سپەیسی فیزیکی لەلای کانت بێ کۆتایی، بێ سنوور، نەگۆڕ بەیەك بەستراوو نەپچڕاو، ئیقلیدی سێ دووری، گونجاو، ئاراستەکانی لەیەك دەچن، هەروەها کاتیش بێ کۆتایی، بێ سنوور، بەیەکەوە بەستراوو نەپچڕاو، گونجاو، ئاراستەکانی لەیەك دەچن، بەڵام ئەمیان تەنها لە یەك دووریە.

لە فەلسەفەی هیگل سپەیس و کات بەرهەمی بیرۆکەی رەهایین (الفکرة المطلقة) کە لە یەکێ لە قۆناغەکانی پەرەسەندنی دروست بوون. بەجۆرێ کە یەکەم جار سپەیس هەبوو دوایی کات. جا بۆیە سپەیس و کات لە فەلسەفەی هیگل دا لە یەکتر جیان.

ماخ دەربارەی ئەم باسە دەڵێ:
**«سپەیس و کات کۆمەڵە هەستێکن»**.

تێڕوانینی ماتیریالیەکان بۆ سپەیس و کات ئەوەیە کە سپەیس و کات جۆرێکن لە جۆرەکانی ماتیریال، ئەم تێڕوانینەش دژی هەموو ئاراستە ئایدیالیەکان دەوەستێ. کەواتە سپەیس و کات پەیوەندیان بە واقیعێکی مەوزوعی یەوە هەیە کە لە دەرەوەی (وەعی) دا هەیە.

فویرباخ لەم بارەوە دەڵێ:

[سپەیس و کات فۆرمی بوونی هەموو جۆرە شتێکن وە بوون (وجود) لە سپەیس و کات خۆی تەنها بوون (وجود)ە]. ئا بەم جۆرە فەیلەسووفە ماتیریالیەکان سەیری سپەیس و کاتیان دەکرد، دوو جۆرە فۆرمەکەی ماتیریال بەبێ ماتیریال کە هیچ شتێك ناگەیەنن، بۆ چوونی بێ مانان. تەجریداتن تەنها لە مێشکەوە هەن. لەبەر ئەوەی ماتیریالیەت دان بە واقیعێکی مەوزوعی دا ئەنێ. واتە ماتیریالی جوولاوەی سەربەخۆی جیا لە (وەعی) یەوە. جا بۆیە ماتیریالیەکان دان بە واقیعی مەوزوعی سپەیس و کات دا دەنێن.

ووتەی ماتیریالی دەربارەی سپەیس و کات لە سەدەی نۆزدەهەم دا سەری هەڵدا وەکو وەلامێك بۆ سەرچاوەی بۆچوونەکانمان دەربارەیان. ئەم دوو شتە لە فەلسەفەی ماتیریالی دا هەن بەشێوەیەکی مەوزوعی و تیۆرەکانمان دەربارەی ئەوان تیشك دانەوەیە بۆ واقیعە مەوزوعیەکانیان، واتە کۆمەڵە هەستێکی زاتی نین و دروست بووی فیکر نین.

چەند ناکۆکیەك لە بیروڕا دەربارەی ووتەی ماتیریالیەکان لەناو خۆیان دا سەری هەڵداوە بەتایبەتی لەم رستەیە:
**(سپەیس و کات دوو فۆرمن بۆ بوونی ماتیریال)**.

بەلام پێکهاتنێکی ڕوون نیە دەربارەی شیکردنەوەی ئەم رستەیەی سەرەوە هەر ئەم رستەیەشە کە بیرکردنەوەی ماتیریالی لە ئایدیالی جیادەکاتەوە.

زۆر لە فەیلەسوفە ماتیریالیەکان ووشەی (فۆرم) یان لە: «سپەیس و کات دوو فۆرمن بۆ بوونی ماتیریال» بە بوونی پەیوەندیەك لەنێوان فۆرم و ناوەڕۆك (الشکل والمحتوى) لە قەڵەم دەدەن. بەڵام ئەم تەفسیرە بەهۆی ئەوەلینی ناوەڕۆك ئەمان خاتە زۆر گیروگرفتەوە کە رەنگە ئەنجامەکەی خۆی دژی خۆی بوەستێنەوە.

**سەرچاوەکان**


١ – Relativity, Special and General theory Vy A.Einsten

2 – AVC of Relativity Vy V.Russel

٣ مدخل الى النظريه النسبيه الخاصه والعامه: محمد باسل

٤ ـ فلسفة الفيزياء: د. محمد عبد اللطيف

٥ ـ تأريخ العلوم الطبيعيه: د. محمد عبد اللطيف

٦ – المادية الديالكتيكية والعلوم الطبيعية: خ. خانالييف
ترجمه: د. هنرى وكر

٧ – تطور الفكر الفلسفي. ثيودور اويزرمان
ترجمة سمير كرم

# لە "فەلسەفەی ئێستاتیک"ەوە



نووسینی: ابن خلدون
گۆڕین و ئامادەکردنی: جلیل کاکەوەیس

## وا ..

**مرۆڤ پێویستە ماوەو کاتی بیرئارامی هەبێت بۆ ئەوەی بپرسێت : بۆچی برێ شت جوانەو هەندێکی تر خەوش‌دارە ؟ بۆچی ؟ لەئەنجامی لێکۆڵینەوە لە نهێنی‌یەکانی هونەری رەسەن‌دا لەعاست ئەم پرسیارەدا رامام :**

**بۆچی جوانی‌یەکی هونەری لە چیرۆکێك یان فلیمێك یان تابلۆیەك‌دا دەبینین‌و لە هی دی‌دا نای‌بینین ؟ پرسیارێکی کۆن‌و دژوار دێتەکایەوە . ئایا جوانی خەسێتێکی هەمیشەیی‌یە لە شتی جوان‌دا ؟ یان گەوهەرێکی سەربەخۆی خودی خۆیەتی‌و بوونێکی سەربەخۆی لاوەکی لە دەروونی مرۆڤایەتی‌دا هەیە ؟ رەخنەی کۆن لەو باوەرەدایە کە جوانی خەسێتێکی هەمیشەیی‌یە لە شتی جوان‌داو بە جوانی‌یەکەیدا هەڵ‌دەدات . وە وەڵامی چۆنێتی ئەو جوانی‌یەش بە کەرەسەی رەوانبێژی دەداتەوە .**

**ئەو هەڵگەرانەوەیەی کە رەخنەگری ئینگلیز (ئیڤۆر ریتشاردز) بەرپای‌کرد . ئاماژەکردنێك بوو لە پەیوەندی نێوان خۆیەتی‌و بابەت‌دا هەروەها ئاوێتەبوونی دەروونی مرۆڤایەتی بە لایەنی تایبەتی بەرهەم هێنانی داهێنانی هونەری‌و هەستکردن بە جوانکاری دروست‌دەکات . بۆیە زانستی دەروونی خستە سەر خەرمانی رەخنەی ئەدەبی‌و داوای دووبارەکردنەوەی نووسین (هونەری) بەگشتی کرد .**

**جوانکاری جۆرێکە لە سۆفێتی :-**

داهێنانی هونەری لای زۆربەی داهێنەرەکان رەگەزێکی سۆفێتی تێدایە ، بۆئەمە ماوەیەك لە عاست ووشەکانی بویژی یۆنانی (نیکۆس کازانزاکی) وەستام . . کازانزاکی باسی چۆنێتی داهێنانی هونەری دەکاو دەڵی : (شتی وام لێ روو دەدات کە ئەوپەری ساکاری‌یە . لەوانەیە ببینی کرمی ئاوریشم کاتێ تاڵە ئاوریشمەکە دەچنێ : بەدرێژی مانگێك گەڵا تووەکە بەتامەوە دەخوات تا دەی‌گەیەنێتە قەوارەی قامکۆکەیەك . لەپڕ لە خواردن دەوەستی لە سپیەوەدەگۆری بە بۆرو زەردێکی زەرد . گۆرانێکی سەیر لە بوونیدا روودەدات ئەو پێستە تەنکەی تەنکتر دەبێتەوە . ناوەوەی هەموو دەبێت بە تاڵە ئاوریشم . سەری بادەداو هێدی هێدی بەدەوری خۆیدا خول‌دەخوات . لە دەمی‌یەوە تاڵێك دەردەچێت هەر ئەوەتە دەبینرێ . داوەکان دروست دەبن . پاش چەند رۆژێك ئەم خانووچە ئاوریشمینە بە وەستایی‌یەکی بێ وێنەوە دروست دەبێت . کرمەکە لە هەموو لایەکەوە دەرگا لەسەر خۆی دادەخات . مردوو ئاسایی تیابدا رادەکشێ‌و چاوەروانی بەهار دەکات . لەلای پێشەوەی خانووچەکەوە گۆری کرمەکە کون دەبی‌و پەپوولەیەکی سپی لێ دەردەچێ کە دوو چاوی بچکۆلەی رەشی هەیە ! . .

منیش وەکوو ئەو کرمە ئاوریشمە خۆم دەبینم کاتێ کە کتێبێك دەنووسمەوە . هەست بە یاسایەکی پەنامەکی دەکەم کە مرۆڤی داهێنەر هەڵ‌دەسورێنێ هەروەکو چۆن کرمی ئاوریشمی چالاك هەڵ‌دەسورێنێ . ئەم دوو داهێنانە یەکانگیر دەکەم . داهێنانی خانووچکەی ئاوریشمین‌و نووسینەوەی رۆمان . .)

زانستی دەروون دەڵێت : لە کاتی داهێنان‌دا یان کاتی دەرکەوتنی تیشکی سروش (إلهام)و بووکی شیعر . هۆشی بەئاگای هونەرمەند لەگەڵ هۆشی نەست (اللاوعي)دا تێکەڵ‌دەبێت . هەروەها وێنەی بیری گردەوەبوو وە خەوی پەنامەك تێکەڵ بە شەپۆلی هەستی وووریا دەبێت . لێرەدا زمانی خەوبینین‌و زمانی ئاخافتن یەکانگیر دەبن‌و دەربرینێکی شاعیرانە دروست‌دەکەن . . (ئەنیرۆدها بەهاری سەرن)ی توێژەرەوەو سۆفی هندۆکی لە لێکۆڵینەوەیەك‌دا لەسەر زمان‌و جەفەنگی (رەمزی) لە ئایین‌دا دەڵێت :

(زمانی سۆفێتی ئایینی بەندیوارێکی توندی لەگەڵ زمانی شیعردا هەیەو رووی لێکچوونیشیان هاوبەشی شاعیریتی (واتا

دەرخستنی هەستی مرۆڤایەتی)و نواندن (دەرخستنی کێشەی نێوان هۆش و ڤیانو خۆڕاگرتن .)ە

**ڕێکار (مستوی) و مەودای زمان :–**

لەبەر ئەوەی زمان دوو زمانە . . واتا لەبەر ئەوەی زمان ناوەڕۆکی هەڵچوون و ناوەڕۆکی ژیری هەیە . . بۆئەوەی باش لەمە بگەین دەگەڕێینەوە سەر لێکۆڵینەوەی چۆنێتی فێربوونی منداڵ ، واتا منداڵ چۆن ئاخاوتن لە دایك و باوکی یەوە فێردەبێت . .

منداڵ لە مەڵبەندی قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری فێری ئاخاوتن نابێت بەڵکو لەنێو خێزاندا فێردەبێت ، تەنانەت ئاژەڵیش توانای کەمە فێربوونێکی هەس ، بەلام شێوەی ئەم فێربوونە چۆنە ؟

فێربوون لە ڕێگای کڵپەسەندنی سۆزەوە پەیدادەبێت . . ئەگەر بە منداڵێك بڵێین : وەرە : لەگەڵیشیا زەردەخەنە بنوێنین و باوەشی بۆ واز بکەین ، یەکسەر تێ دەگات کە ئەم بانگ کردن و نواندنە نیشانەی خۆشەویستی یە ، بەلام ئەگەر پێ ی بێژیت : برۆ : لەگەڵیشا چارە لێك بدەین ئەوا لە ڕێگای دووبارەکردنەوەوە تێ دەگات ئەم وشەیە مانای تووڕەیی یە . یان بە بارێکی دیدا ئەو تووڕەبوون دەزانێت پێش ئەوەی واتاکەی فێربێت . .

ئاژەڵیش بە هەمان شێواز فێردەبێت ، لە کتێبی (زمان و بیر لەلای منداڵ)دا نووسین مامۆستا (جان بیاجێ) دەبێنێ هزرو بیری مرۆڤ دەکات بە دوو بەشەوە :–

یەکەم –– هزری ناخ و خۆیەتی

دووەم – هزری ئاراستەکردن .

خەسێتەکانی بەشی یەکەم بریتی یە لە بیرێکی خەیالاوی گەلالە نەکراو کە پەیوەندی بەشتی ناماقوڵەوە هەیەو لە بەرکارهێناندا وێنەی خۆیەتی و شێوازی کەسێتی بەکاردەهێنرێت کە توانای گواستنەوەو بەیەك گەیشتنی نی یە لەگەڵ کەسانی تردا . . ئا ئەمەیە بیزی منداڵی و بیری خەوبینین و ئەفسانە . . بەڵگەش بۆ بەشی دووەم ئەگەر بە منداڵێك بڵێین : سەربەستی . .

هیچی لێ تێ ناگات ؟ چونکە سەربەستی چەمکێکی واتایی یە کەچی بە بارێکی دیدا تێ دەگات ، بۆ نموونە ، ئەگەر پەلەوەرێك بخەینە نێو قەفەزێکەوە لەپاشا بە بەرچاوی منداڵەکەوە پەلەوەرەکەمان ڕەهاکردو پێ یمان ووت : ئەم باڵندەیە بەندبوو ئەوا ئێستا ئازادە . .

بەم جورە شتی واتایی تێ دەگات هەر وەکو چۆن مرۆڤ لە سەرەتاوە فێربووە . . کەواتا دەبرین بە نواندن و دەست نیشان کردن و وێنە بنەمای هەموو فێربوونێکە لە گشت هونەرێکدا ! . .

وێنەش چ بە ڕەسم کردن بێت و چ وێنەی ئەدەبی بە ووشە بێت کە مەبەست و ئاماژەو هەڵچوون بە هەموو هونەرەکان دەبەخشێت ، وێنەش ئامرازی دەبرینی هونەری یە . . ئەو وێنانەی کە زۆربەی خەڵك تێ ی دەگەن بێگومان ئەو وێنانەن کە لای ئەو کۆمەڵەی تیایدا دەژێت ئاشنان و وێنەی هونەریش وێنەیەکی کۆمەلایەتی یە .

زمان ئامرازی دەربرین و بەیەك گەیشتنە لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵ داو ڕەنگدانەوەی وێنەشە هەندێ زمان هەن تا ئێستا لە قاوغە کۆنەکەی خۆیاندا ماونەتەوەو ، تەنها وێنەیان گۆڕێوە بە ڕەمز وەکو (زمانی چینی و یابانی) . زمان دەردانێکی (إفراز) کۆمەلایەتی یە ، هەموو ووشەیەك بریتی یە لە بنکەیەك و سۆزی تیا هەڵ دەچێ ، شاعیرەکانیش ئەم لایەنە باش شارەزان بۆیە فرە بە پەرۆشەوەن لە هەڵبژاردنی ووشەی کاریگەردا .

قاڵبی جەفەنگی لە زماندا بریتی یە لە هێمای دەرەوەو بە هەموو کەسێکی ئاشنا دەکات ، بەلام ناوەڕۆکی سۆزو هەڵچوون کە بریتی یە لە ڕەگەزەکانی ناخی ناخەوەو بەتوندی پێوەی دەلکێ . . لەوانەیە بیانی یەك بە ئاسانی فێری زمانێکی دی ببێت بەلام ناوەڕۆك و سۆزو هەڵچوونی زمانەکەو جێ گۆڕکێ ی سێبەری وشەکان فێر نابێت مەگەر بە پراکتیکیکی دوورو درێژ نەبێت .

ئاستەنگەکە لەوەدایە کە هەست کردنی شتێکی تایبەتی یەو بیرکردنەوەش زێتر : چۆن دەتوانرێ هەموو تایبەتی یەك بکرێ بە گشتی ؟ لێرەدا ڕۆڵی زمان قووت دەبێتەوە کە مێژووی دوورودرێژی کۆمەڵ دروستی کردووە ، بۆئەوەی لە بیرێکی ویژدانی ئاراستە نەکراوەوە بگۆڕێ بە بیرێکی جولاوو کاریگەرانە تا هەموو کەسێك پێش وازی لێ بکاو پێشی هەڵبچێ . .

**ئاستەنگی دەربڕینی هونەری :–**

مەسەلەی دەربڕینی هونەری تەنها گۆڕینی بیر نی یە لە تایبەتی یەوە بۆ گشتی بەڵکو هەر بۆگشتی یە بەمەرجێ دەست بە سیمای تایبەتێتی و زاتی یەوە بگیرێ . گیروگرفتی دەربڕینی هونەری بریتی یە لە بڕینی بۆشایی نێوان ڤیانی دەربڕین و توانای دەربڕیت بەشێوەیەك ختوکەی هەست بداو هەست بە جوانی یەکەی بکرێ . ئەم بۆشایی یەش گەرەکە ڕاستی و خەوبینین لێك بدات و ڕاستی یەکەش بە باڵی خەیاڵ بفرێ و خەوبینینەکەش گەشەبکات . . (داهێنانی هونەری لە کۆکردنەوەو

ووردبوونەوەو خستنەسەردایە ، بابەتی تازە لەدایك دەبێت ، بۆئەوەی شتی بێ کۆتایی‌و بێ سنوور بەهۆی کۆتایی‌و سنووردارەوە دەربڕێت ، بەهۆی وێنەیەکی هونەری‌یەوە باسی ڕاستی‌یەکی هونەری بکات . . ڕێباز ببێتە پێوەری سروشت . کاتێ کە دەڵێن ئەدەبی ڕەسەن نە ژیان ڕاستگۆترەو شیعریش لە مێژوو ڕاستگۆترە تەنها بۆ دەرخستنی باسەکەی پێشوو .)

ئەگەر دەروون‌و ناخی مرۆڤایەتی چوارچێوەیەکی ژیری‌و ناوەڕۆکێکی ئارەزوومەندی هەبێت ئەوا هەموو هونەرێك ڕەگەزی ژیری تێدایە کە پی‌ی دەبێژن ناوەڕۆك یان مەبەست‌و حەزو هەڵچوون . . .

سەرچاوەی هەست‌کردن بە جوانی‌و پێوەرەکانی تەنها لە هۆش‌دا نی‌یە بەڵکو بەشێوەیەکی پەنامەکی لە دوورترین پێچ‌وپەنای هەست‌و نەست‌دا هەیە . . . یەکەم جار مرۆڤ وێنەی کێشا پێش‌ئەوەی مەبەست دەربڕێت ، منداڵیش هەمان شت دەکات . لە مۆزیقادا چێژ لە ئاوازەکەی وەردەگرین پێش‌ئەوەی هامۆنی بزانین ، هەر بە مۆزیقاش هەڵ‌دەپەڕین بەرلەوەی ناوەڕۆکی سۆزەکەی تێ‌بگەین . . هەر لە مێژە چێژمان لە شیعر وەرگرتووە پێش‌ئەوەی مەبەستی شیعر بزانین چی‌یە !

مرۆڤ کاتێ دەستی‌کرد بە وێنە کێشان وەکوو جۆرێك لە جۆرەکانی چالاکی ڕۆژانەی گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە کەڵکێکی لێ وەرگرتووە ، وە لەگەل گەشەکردنی هۆشی مرۆڤ‌دا هەست‌کردنیش بە ئامانج‌و ناوەڕۆك گەشەی‌کرد . داهێنانی وێنە بە هاندانێکی کەسێتی بۆ دەربڕینی کەسێتی‌یەکە دەستی‌پی‌کرد . لەوەودوا گۆرانی بەسەردا هات‌و بوو بە ئامانج بۆ کارکردنە سەر هەستی کەسانی دی‌و ویژدانی کەسانی دی . ئەمەش چێژێکی تازە بوو کە مرۆڤ لەنێو کۆمەڵگا گەورەکان‌دا ژیاو . دۆزی‌یەوە . لەو کاتەیدا مرۆڤ ئاستەنگی یەکان‌گیرکردنی ڕوخسارو ناوەڕۆکی هاتە پێش کە ئەمیش گیروگرفتی دەربڕینە ، خەڵکی گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە هەموو کارێکی هونەری بریتی‌یە لە کورت‌کردنەوەی هەڵوێستێکی مرۆڤایەتی‌و کۆمەلایەتی تایبەتی لەو ژینەوارەدا (واتا لە سروشت‌و لەو کۆمەڵەی کە هەیە .)

وە ئەم باری هەڵوێستەش یان شۆڕش‌گێڕانەیە یاخود بێ‌دەنگی‌یە یان پاکانەکەرە . . گرنگ ئەوەیە کە دەربڕین ڕووبەڕووی ئاستەنگی ئیلتیزام بووەوە ، لە کاتێك‌دا کە نووسەر یان وێنەکێش یان سینەماگەر دەیەوێ کار لە ویژدانی خەڵکی بکات پێویستە کارەکەی هەڵگری نامەیەك بێت ، لەم لایەنەوە شتێکیان پێ ڕادەگەیەنێت یاخود سەرنجیان بە بارێکدا ڕادەکێشێت : لێرەدا ناوەڕۆك بوو بە ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکانی (ئیستاتیك) ، ڕەگەزێکە بەهیچ جۆرێك لە ڕووخسار دانابڕێت هەر وەکو چۆن بۆن لە گوڵ جیا نابێتەوەو کەسێتی مرۆڤیش لە لەشی جودا نابێتەوە . گریکەکان یەك‌گرتنی جوانی‌و خێرو چاکەیان بە پێویست دەزانی . لەبارترین نزاو پارانەوەیان ئەوە بوو : (خوایە جوانی‌یەکمان پێ ڕەوا ببینە تێکەل‌بێت لەگەڵ خێرو چاکەدا .)

لە هەمان کات‌دا نزایەکی بەسۆزی (ئۆراتۆریۆ) سەمفۆنیای نۆیەمی بتهۆڤن بوو . . تەنانەت ئەمە لە جوانی مرۆڤیش‌دا دێتەدی چونکە ژنی ڕوخسار شۆخ‌وشەنگ بەهۆی حەز (غریزة)ەوە پیاو بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت چونکە سروشتی بایۆلۆژیمان وای کردووە کە مەرجی تێرکردنی حەزەکانمان تێرکردنێکی تەواوبێت دیارە ئەمەش خۆی لەخۆیدا مەرجێکی جوانی لەشە یاخود ئەو— هەستەیە کە یەکەم جار جوانی ڕوخسار دەردەخات ، بەلام هەستی کۆمەلایەتی مەرجێکی واتایی خستە سەر جوانی ئەویش ڕەوشتە کە بریتی‌یە لە کۆمەڵێك یاسای کۆمەلایەتی . . چونکە یاسای جوانی وەکو هەر چەمکێکی تری مرۆڤایەتی لە ئەنجامی هەڵس‌وکەوتی مرۆڤ لەگەڵ ژینەوارەکەیدا بەردەوام گەشەدەکات .

بە کورتی – هەموو هونەرەکان لە ڕووخساردا یەك‌دەگرنەوە لەو کاتەیدا کە لە ڕەگەزە هاوبەشە بەدلا چووەکان‌دا لەنێو کۆمەل‌دا ڕووبەڕوو دەبنەوە ، چونکە تێکڕا دەست‌کردنی حەزو هۆش‌و شتی خۆڕسکی مرۆڤن ، هەموو هەڵقولاوی داهێنانێکن کە خودی مرۆڤ دەردەبڕن بەمەرجێك کۆمەلە لی‌ی تێ‌بگات . کردووەیەکە بۆ پێك‌هینانی ئەزموونی ناخی مرۆڤ ئاراستە دەکرێت لە چوارچێوەی شێوازێکی کۆمەلایەتی (لە بازنەی زمان‌و وێژەو وێنە کێشان‌و هونەری تەشکیلی) ئەم کارەش ناگاتە چڵەپۆپە تا کەسانی دی چێژ لە بەرهەمی ئەو داهێنانە هونەری‌یە نەبینن چونکە هەر هونەرمەندێك بریتی‌یە لە باوەڕنامەیەك بۆ گونجاندنی مرۆڤ‌و سروشت ، وە بۆ گونجاندنی حەزو هۆش لەنێوان زات‌و بابەت‌دا

تێبینی : ئەم ووتارە لە گۆڤاری (القلم) ژمارە «۲» سالی ۱۹٦۷ وەرگیراوە



# کاتێک گڕکانی فیزۆف تەقیەوە

# هەڵبژاردن، یا گڕکان ؟..

نووسینی : د. شاکر مصطفی
وەرگێرانی : فاتح عبدالکریم

رۆژێك بوو وەك رۆژی قیامەت . . .
دایكت دەدی كۆرپەی بەرمەمكانی لە بیردەچوویەوە . . . ، هەر سك پڕ بوو بەری‌دەخست . . خەڵكیت دەدی سەرخۆشن ، كەچی سەرخۆش نین ، بەڵام سزای یەزدانی گەورە تیژو بەتاو بوو . .

لەوانەیە دەنگ‌و باسی شاری (بومبی)ی ئیتالیات بیستبێ ، ئەو شارەی بوو بەژێر دووكەڵ‌و بلێسەی ئاگرەوەو تا ئیستاش ! . .

خۆزگەگەر نەتبیستبێ ئەوا خەڵك دەگێڕنەوە كەبەر لە هەزارو نۆسەد ساڵ گڕكانێكی ئارام ، كەدراوسێی ئەم شارە بوو پێیان دەوت گڕكانی (فیزۆف) ، هەڵچوو . . هەورێكی رەنگ خۆڵەمیشی‌ی ئاگراوی هێنا بەسەر شارەكەداو هەرچی تیابوو داپۆشی‌و سەمەسای بری . .

قەزاو قەدەر لە پردای بەسەریا ، هەتا ئیستاش نیشانەی ئەو لەپڕ بەسەرادانە بـــەلـــەشە رەش هـــەڵگەراوە خەڵووزی‌یەكانەوە دیارو نومایانە . .

ئەم كارەساتە لەناو خەڵكدا بلاّوبوویەوەو ، ئەم شارە نەفرین لێ‌كراوە ئەمرۆ یەكێكە لەو شوێنانەی كەبەهۆی گەشت‌و سەیرانەوە بوونەتە هۆی دەرامەتی گەشت‌و گوزاری ئیتالیاو ، خەڵكی لەم شارەدا بنیادەمی بە خەڵووزبووو پەیكەرو گەرماوەكان‌و شانۆگاكان‌و راگەیاندنی پروپاگەندەكانی هەڵبژاردن دەبینن .

بەڵام كەس چیرۆكێكی لە بیرەوەچووی هاوچەشنی ئەم چیرۆكەی نەبیستوە كە زۆر دەمێك نیە لە شاری (سان‌پییر)دا رووی داوە ! . .

٧٨ ساڵ لەمەوپێش ، یا ئەگەر بە وردی دەتەوێ ساڵی (١٩٠٢) تەنها باری رامیاری نەبێ هەموو شت لە (سان‌پییر)دا ئارام‌و لەسەرخۆ بوو ، ئەو شارەی كە لە گوێ دەریای كاریبی نیوە دورگەی (مارتنیگ)ی فەرەنسی دا نووستبوو[١]

دانیشتوانی ئەم شارە گوێ دەریایە كەسی‌ی هەزار بوون سەرگەمی هەڵبژاردنی نوێنەری ئەنجومەنی تەشریعیان بوون . . . دوو نوێنەرەكان ، نوێنەری زوربەیی‌و كە مایەتی ، ئەو ژمارە دەنگانەیان دەست نەكەوتبوو كە بەپی‌ی قانوون بۆ سەركەوتنیان پێویست بون . . بۆیە دەبوا هەردوكیان جارێكی تر ، واتە پاش دوانزە رۆژ ، تی‌هەڵچنەوەو بچنەوە نێو هەرای هەڵبژاردن ! . . .

### كاتی قسە نیە !

یاریدەرانی هەر دوولا هاتن بەیەكاو كار گەرم بوو ، دیارە لەم كاری هەڵبژاردنەدا خەڵكی شارەكە هەموو هاوبەش بوون : سەرۆكی شارەوانی ، مامۆستای فیزیكی قوتابخانەی ئامادەیی ، خاوەنی تاقەكارگەی شەكری شار ، قەشەی كڵیسەو ، خاوەنی رۆژنامە تاقانەكەی (سان‌پییر)یش دیارترین كەس بوون لەم هێرشی هەڵبژاردنەداو لە مەیدانی ئەم زۆرانبازی‌یە دا . . . هەموو خەڵكی شارەكە نوقمی دەریای هەڵبژاردنەكە بوون . . چۆن نوقم بوونێك ؟ . . تەنانەت ئەو كورسی‌یانەی كەهەموو رۆژێكی یەك شەممو رێك دەكران بۆ سەركەوتنە سەرلوتكەی گڕكانی (بیلی)[٢]ی پیر لە شاخەكەی پشت شارەكە بۆ سەیركردنی دەمی گڕكانەكە .
كە پەنجا ساڵ بوو بێ‌دەنگ بوو هەناسەی نەدابوو ، بگرە هەندێ دارودەونیشی لێ سەوز بوو بوو ، هەندێ گژوگیای پیا هەڵزنابوو . . . بەڵێ تەنانەت ئەم كورسیانەش لەم هەفتەدا بە بۆنەی هەڵبژاردن‌و بەیاننامەی هەڵبژاردن‌و دەمەقاڵەی ئەم وئەو پشت گوێ خران‌و رێك‌نەكران‌و ، خەڵك بەهۆی سەرقاڵی ئەم هەڵبژاردنەوە ماوەی ئەوەیان نەبوو زۆر گوێ بدەنە ئەوەی كە دووسێ هەفتە دەبێ دووكەڵ وردە وردە خەریك بوو لە دەمی گڕكانەكەوە دەكشایە دەرەوە . . . ئەو دەمەی كە وەك پیرە ژنی لەسەرخۆ بەسەر شانەكەیدا دەڕوانی . . . .

جا كە مامۆستای فیزیك رۆژی (٢٨)ی نیسان لەكاتی كۆبوونەوەی ئەنجومەنی شارەوانی دا هەڵساو بە دڵەراوكێ‌یەوە سەرنجی پارێزگەری بۆ ئەو دووكەڵە رادەكێشت پارێزگەر قسەكەی لێ قۆزتەوەو گلەیی لی‌كرد :
– ئیستە كە نزیكە هەڵبژاردنەكە بدۆڕێنین كەی كاتی ئەم قسانەیە ؟ ! . . . ئەم گڕكانە هەزاران ساڵە لەم شوێنەی خۆیداو ، لەجی‌ی خۆی نەجوولاّوەو لای نەداوە . . . دەڵی‌ی گەرێ با بۆ خۆی هەناسەیەك بدات‌و هەندی هەڵم‌و دووكەڵ بەرەلاّ بكات ! . . ئەوەی

گرنگ بێت ئیستە ئەوەیە کە لە بەینی ئێمەو هەڵپاڵێوراوی ناحەزدا تەنها (٣٠٠) سێصەد دەنگە ، لەسەرمان پێویستە سەربەخۆکان بۆ لای خۆمان راکێشین کە (٨٠٢) دەنگیان هەیە . . . ئەگەر وانەکەین پاش (١١)ی مایس ناحەزەکان نوێنەرێکیان دەبێت . . ئاخۆ هیچ پێشنیارێك لەم بابەتەوە هەیە ؟ ! . .

رۆژی (٢٨)ی نیسان بو (راهبة) کانی (دیر)ەکەی قەدپاڵەکە ، کە ..توت چۆلەکەی هەڵواسراوە ، هاتنە .ی قەشەو وتیان : بابە زۆر دڵ نارەحەتین چەند رۆژێکە دیرەکەمان تاقە چۆلەکەیەکی نەدیوە ، چۆلەکەکان راینکردوە . . مار لەسەر زەویەکەمان زۆر بووەو . . لە کون دەرچوون ! . . .

– ئەزانم ، ئەزانم گڕکانەکە کەمێك دووکەڵی لێوە دێت ، دووکەڵیش چۆلەکە وەرس دەکات ، ماریش هەمووکات هەر بووە . . هیچ نیە . . . بڕۆن بەلای نوێژەکانتانەوە ! . .

لە هەمان رۆژدا لە کارگای شەکرەکە دا ،کە یەك کیلۆمەتر لە باکووری شارەوە بوو ، خاوەنی کارگەکە پێشوازی لە نێردراوانی کرێکاران کردو ، لە کاتی قسەو گفتوگۆدا پێیان وت :–

ئێمە دەنگێکی خنکاو ، نرکەیەك دەبیسین دەڵێیت لە قووڵاییەوە دێت و ، کارگەش لە ئاوەرێژگەی لووتکەکەوەیە .

+ دۆستەکانم ! ئەم گڕکانە پێش پەنجا ساڵ نەختێك دووکەڵی کرد ، بگرە هەندێکیش گڕی لێ بوویەوە ، بەڵام لە پاش ئەوە هەر لە خۆیەوە دامرکایەوەوێ دەنگ بوو . . . دیارە پیر بوە ، پەکی کەوتوە ! . . . خۆم سەر دەکەومە سەر لووتکەکە بزانم چی‌یەو ، هیوادارم ئەمە دڵنیاتان بکات . .

لەگەڵ ئەوەشدا کەدی ئاوی شیوەکە هاتوەتە کزی (هەڵبەت ئەمە نیشانەی نزیك‌بوونەوەی تەقینەوەی گڕکانە بوە –وەرگێر) کە لە لوتکەکە هاتەوە خواری بەکرێکارەکانی وت :–

یاڵلا ترسنۆکەکان ! بۆ ئیش . . . هیچ نیە ! . . تەنیا زەلامێك هەبوو لەو شارەدا کە نەگڕکانی بەخەیاڵدا دەهات و ، نەهەڵبژاردنەکە ئەویش قولەرەشێکی بەندی بوو کە نزیکی دوو مانگ بوو لەسەر هەندێ دزی خرابوە بەندیخانەو ، هەموو ئیش‌وکارێکی ئەوە بوو جوێن بە وەردیانە پاسەوانەکەی بدات کە فرێی دابوە ژوورێکی رەق و تەق وەك بەردی ، شێ‌داری تاریکی‌ی قووڵ . .

رۆژی دووەم هەندێ لەوانەی سەرکەوتبوونە سەر لوتکەکە دیبوویان کە دەمی گڕکانە پڕبوە لە ئاوی گەرم ، کە جاران تەنها لەبنەکەی دا نەختێ ئاو دەبینرا . . هەروەها دی‌یان لە راسەری دا هەورێکی بوخارین راوەستاوە ، کەجاران نەهەور بوو نە هەڵم . .

## رێکەوتێکی خراپ ! . . .

ئێمە دوو جۆرە تەقینەوە دەبینین : یەکەمیان لە نێو سەراندایەو ، دووەمیان لە شاخ‌دایە ، یەکێکیان لە وتارو پارەو کارتی دەنگ داندایە ، ئەویتریان لە دووکەڵ و ژێلەمۆدا . . گڕکانی هەڵبژاردنیش ، ئەویش ، هەر دووکەڵ دەکات و ، پێش (١١)ی ئەم مایسەی کەدێت دانامرکێتەوە . . بەڵام ئاخۆ ئەویتریان کەی دادەمرکێتەوە ؟ ! . .

کە گڕکانەکە دەستی‌کرد بە فرێ دانی بەرد لەگەڵ دووکەڵ دا قەشەکە دی جێ نوێژی نوێژ کەرەکان لە کەنیسە دا پڕ بوویەوەو ، ریزی چاوەڕوانان لە بەردەم دەلاقەی دانپیانان دا درێژ بوویەوە . . بەڵام دەریا ئارام بوو . . ئەوانەش کە هەندێ بەلەمیان هەبوو سواری بوون تا لە دوورەوە دیمەنی گڕکانەکە ببینن کەوەك نەهەنگی گەورە لووشەی دێت ! . . دیمەنەکە لە دەریاوە زۆر نایاب بوو ! . . .

تەنها بەندی‌یەکە کە باسمان‌کرد بە هیچی نەدەزانی و گوێی بە هیچ نەدەدا حاکمی شارەکەش هیچ ئاگای لە دنیای ئەم شارە نەبوو چونکە لەو رۆژانە دا لەوێ نەبوو ! . .

لە پاش دوو رۆژ کەمێ دۆخ گۆڕرا ، ئاگری هەرای هەڵبژاردن لەگەڵ نزیك بوونەوەی رۆژی دەنگداندا بەتین تر دەبوو . . . دڵەڕاوکەو ترسی تەقینەوەی گڕکانەکەش لە زیاد بوون و پەرە سەندنا بوو . . هەموو خەڵکەکەمات و دڵگیراوی ئەو هەورە دووکەڵی‌یانە بوون کە بەرەبەرە خەست تر دەبوون ، هی ئەو بروسکە ئاگراوی‌یانە بوون کە بە ئاسماندا هەڵدەچوون و ، بەبۆنی گۆگردینی ئەو خۆڵەمیشەی کە بەرز دەبوویەوەو دەکەوتەوە سەر زەوی .

هەموو خەڵکەکان دڵگیراوی ئەم باس و خواسە بوون ، تەنها خاوەنی هەرای هەڵبژاردن نەبێ ئەوان لەوە دەترسان ئەم دەنگ و باسە کار بکاتە سەر ئەنجامی هەڵبژاردنەکەو ، بەدڵی ئەوان نەبێت ، بۆیە نەفرینیان لەم هەڵکەوتە بەدە دەکردو ، لەسەر پێویستی‌ی دڵنیاکردنی خەڵك سوور بوون و ، دەیانوت : هیچ نیە ! . .

شەوی (٣)ی مایس بوو کە زنجی‌یە بەندی‌یەکە خەو نەچوە چاوی و خەوی زڕابوو هەرایەکی بەرپاکرد لە توورەیی‌یەکەی نێو سینگی زۆر بەتین تر

بوو ، هەموو زەویی ژێر پێی پڕ دەکرد . . . قیژانیو ، قیژانی ، بە هەر دوو دەستو پێی دەیدا لە دەرگا . . . کەس وەڵامی نە دەدایەوە ! . .

بۆ سبەینێی شارەکە هەمووی لە دەریای ترسدا نوقم بوو . . ترسی شێت لە نێوچاواندا‌و لە کۆڵاناندا هاتو چۆی بوو ! . . قەشەکەش بە نوێژکەرانی نێوکڵیسەی دەوت : دوعای «ئیمانم هەیە بە خودا» بکەن . . لەلایەکی تریشەوە تیپ تیپ لەوانەی دەیانویست دانپیانین لە بەردەمیدا کۆمەڵیان کردبوو . . .

خاوەن کارگاکەش ژنەکەی دڵنیا دەکردو دەیوت :

– ئەگەر بارو دۆخ خراپ بوو تەنها صەد مەتری ترمان لە بەردەمدایە ، دەیبڕینو دەگەینە کەشتیو بۆی دەر ئەچین ، مەیەڵە ماڵەکە بگریت ، ژیری بکەرەوە ! . . .

سەرۆکی شارەوانیش بەیانی زوو لەخەو هەستاو ، ئەم بروسکەنامەی بۆ حاکمی جێنشین نارد :–

«مەترسی گڕکانەکە تادێ زیاتر دەبێت ، خەڵك زراوی تۆقیوە ، چاوەڕوانی فەرمانتانین ! . . » بەڵام ڕۆژێکیشی بەسەردا تێپەڕیو وەڵام نەبوو ! . .

لە کۆبوونەوەیەکی کوتڕپڕ دا کە لە پارێزگە بەسترا مامۆستای فیزیك هەستایە سەرپێو وتی :–

«لەو باوەڕەدام نابێت ئێمە وەك (بومبی) دوایمیان بێت ، دەبێت شارەکە چۆڵ کەین . .»

سەرۆکی شارەوانی قیژاندی بەسەریاو وتی : تۆ ئەزانی مەعنای قسەکەت چییە ؟ ئەتەوێ لە گەرمەی ئەم هەڵبژاردنە دا ، کە حەفتەیەکمان ماوە بۆ دەنگدان ، بە (٣٢) هەزار کەسی خەڵکی شارەکە بڵێین : کێ دەتوانێ خۆی ڕزگار کات با بیکات ! ! . . .

من بەر پرسیاریی وا تەحەممول ناکەم ، ئەگەر حاکم دەیکات بابیکات ! ! کاربەدەستیش ئەم بەر پرسیارییەی هەڵنەگرتو بروسکەیەکی بۆ لێدان :–

«ئاخۆ هەست ناکەن بەگرنگیی بارو دۆخی پڕ مەترسی هەڵبژاردنەکە ؟ ! جەماوەر ئارامو دڵنیا بکەنو ، با هەرکەس لە شوێن کاری خۆی بمێنێتەوە ، منیش داوای ئامۆژگاری لە پاریسەوە دەکەم ! . . .»(٣)

دیار بوو (حاکم)ەکە پیاوێکی دوور بین بوو ، دەیزانی مەسەلەکە مەترسی ئەوەیە کە حکوومەت کورسییەك لە ئەنجومەنی نیابی دا بدۆڕێنێ . . .

جا ئەگەرچی بروسکەی وەزیر بۆ حاکم دواکەوت ، بەڵام تێکڕا لایەنگری ڕای حاکم بوو ، ئەوە بوو نووسیبووی :

«گرنگیی هەڵبژاردنەکەتان دەخەمەوە یاد ، پشتمان بە تۆ بەستووە کە مەحاڵیش بکەن لە پێناوی بەرێوەبردنی کاروبار دا بە شێوەیەکی تەبیعی ! . . هەتا خولی دووەمی هەڵبژاردنەکە تەواو دەبێ ، ئەو کاتە خۆتان سەربەستنو چی بە باش دەزانن بۆ چاری ئەم کارە دەیکەن ! . .»

فرکان فرکان بوو لە نێوان گڕکانو کاتی دەنگدان دا . . . پاش حەفتەیەك لەو ڕۆژەوە کرێکارەکانی کارگای شەکر سازی کاتی نیوەڕۆ لەبەر قاپیی کارگەکە دا ، کە لە دەرەوەی شار بوو ، کۆبوونەوەو هەموو دەترسان . . .

خاوەنی کارگەکە پێی وتن :

«ئەگەر دەترسن دەتوانن بڕۆنەوە بۆ ماڵ ، بەڵام ڕۆژی دوو شەممو بگەڕێنەوە سەر ئیش . . . منیش پشووی حەفتەیم لەسەر کەشتییەکە دەبەمە سەر ! . . .

کەشتییەکەی سەد مەتر دوور بوو . . ژنو کچەکەی لەبەر قاپیی ماڵەکەیاندا ڕاوەستا بوون کە یەکێ لە کرێکارەکان قیڕاندی :–

شاخەکە ئەڕووخێ . . . شاخەکە ئەڕ . . . بەڵام قیڕەکەی تەواو نەکرد کە دیوارێك لە مەعدەنی تواوەی ئاگرین لە (٣٠) مەتر بەرزتر کارگاو کرێکارو خاوەن کارگەو خێزانەکەی بۆ ئێجگاری پێچانەوەو لوولیدانو لە گوێ دەریاکە دا دای بە زەویداو سەقامگیر بوو ! . . . دەکوڵا ! . . .

تەپۆڵکەیەك تاشی سووری ڕەش هەڵگەڕاو بە خۆیو هەرچی لە ناویدا بوو دەکوڵاو ، دووکەڵو هەڵمو بڵێسە وەك گەردەلوولێ لە گەردەلوولە بە تەوژمەکانی دۆزەخ بەرز دەبوویەوە .

ئەم کارەساتە هەمووی چەند چرکەیەکی خایاند ! . . گڕکانەکە لە پڕ گەڕایەوە سەر دۆخی جارانی . . وەك نەبای دیبیو نەبۆران . .

لە شارەکەدا کە دوو کیلۆمەتر دوور بوو مامۆستای فیزیا دەرپەڕینی گڕە بەردینەکەی دیبوو ، زانی کە بێ گومان کارگاکەی لەناوبردووە لای کەمی (٣٥) لاشەی تێدا بوە بە خەڵوز ! . . بۆیە ڕایکرد بۆ لای سەرۆکی شارەوانی . . . ئەو قەشەش کە ڕاهباتەکان هاتبوونە لایو نانی نیوەڕۆیان لا خواردبوو ، ئەویش ، لافاوی بە هەڵمەتی ئاگرینی دیو پێی وتن :–

«بێگومان خودا خستوێتیە دڵتانەوە کە ئەمڕۆ دێرەکە بەجێ بێڵن . . . دێرەکە پێچرایەوە وەك چون تۆمار کتێب دەپێچێتەوە ! . . خودا ڕەحم بە دیرەکە

بکات ، لە ئاگردا گۆر کرا ! . . .

ئەو ڕۆژنامەچی‌یەش کە نەیدەزانی کارگاکە چی بەسەرهاتوە نووسی بۆ ڕۆژنامەکەی :-

«قوڵپێك مەعدەنی تواوە تەقیوەتەوەو ،شەپۆلی دەریا نەختێك ئاڵۆزە . . . لەسی‌ی مەتر زیاترە ! . . بێ‌گومان ئەنجامی بوومەلەرزەیەکە لەژێر بنی دەریاوە ! . . . بەندی‌یەکەش لە قووڵایی ژوورەکەیدا هەستی بە لەرینەوەی زەوی دەکرد لەژێر پێیداو ، بەهەر دوو دەستی لە دەرگاکەی دەدا ، بەڵام کەس نەیدە بیست ! . . .

وەردیانەکان خەریکی خۆیان بوون نەیاندە پەرژایە سەر ئەو ، پێویستیەکانی خۆیان کۆ دەکردەوە . . . قایەکاری‌یان دەکرد بۆ کارەساتەکە . . . شار هەمووی نیشتبوویە ترس‌و لەرزی ڕاکردن . .

لە پارێزگاکەشدا بەرێوەبەرانی هەڵبژاردن کۆبوونەوە : چ بکەین ؟ ! . .

سەرۆکی شارەوانی وتی :-

«ئامۆژگاری‌یەکان زۆر ئاشکران ڕێگای هیچ جۆرە ئاژاوەیەك نادرێ ! . .»

مامۆستای فیزیك وتی :

«ئێمە گاڵتەمان دێ بە ئامۆژگاری‌یەکانی حاکم ! . . . ئەو (٣٠) کیلۆمەتر لە ئێمەوە دوورە . . مەترسی لە هیچ نیەو پاڵی لی‌داوەتەوە . . ئێمەش گڕکان هەرەشەی لەناوبردنمان لێ دەکات ، ئێمە پیویستە شارەکە چووڵ کەین . . .»

- ئامۆژگاری‌یەکان هی حاکم نین ،هی وەزیرە لە پاریس . . وەزیری شوێنە داگیرکراوەکان ! . .

ڕۆژنامەچی‌یەکەش وتی :-

دەبێ قسەیەکم بدەنێ بۆ ڕۆژنامەکەمان . .

- حازرە . . . بنووسە :- «مەیەڵن بەبێ هۆ ترس داگیرتان کات ، خەریکی ئیش‌وکاری ئاسایی خۆتان بن . . . هەڵبژاردن هەیە . .»

ڕۆژی دوو شەمموی (٥)ی مایس حاکم گەیشت ! . . گڕکان دەستی پی‌کرد . . نرکەی وای لێ دەهات ڕەگەکانی لەشی مرۆی دەپسان . . . هەوری دووکەڵ‌و هەڵمی فڕێ دەدا .

مامۆستای فیزیکیش هاتە لای سەرۆکی شارەوانی‌و تکای لێ کرد :-

پێویستە بەرێك‌وپێکی شارەکە چۆڵ بکەین‌و ، بەرەبوەبەرایەتی‌ی بانقەکان داخەین . .

- حاکم ئەمری پێ نەکردوین ! . . ناتوانین ! . .

- دەپی‌ی بڵێ با بێتە شارو بە چاوی خۆی ببینێ : کوا هەڵبژاردنەکەی ؟ ! نابینێ هەندێ ڕایان‌کردو هەندێکیشیان خەریکی ڕاورووتن ؟ ! . .

- ڕاستە ، بەڵام ! . .

سێ شەممو (٦)ی مایس

هەراو گێرمەو کێشە لەبەردەم (کاهن)ی دان‌پیاناندا لە کڵێسە گەیشتوەتە ئەو پەڕی ، ئافرەتان‌و مناڵانیان پێش‌خست . . هەندێ خەڵکیش لەسەرگوێ‌ی دەریا شەرە شانیان بوو ، هەرکەس دەیەویست ئەو پێشکەوی‌و سواری کەشتی بێت . . پیرە مێردێك کارە ساتی کارگەی بەچاوی خۆی لەنزیکەوە دیبوو . . . کورەکەی لەو کارەساتە دا لە کیس چوو بوو بە دەنگی ترسینەرانە دەیقراند :-

ئەم شارە نەفرین لی‌کراوە چۆڵ کەن . . . (سدوم) بەجی‌بێڵن .

حاکمی (٣٠) کیلۆمەتری دوور لە (سان پییر)یش دوو بروسکەنامەی پی‌گەیشت . . یەکەم لە پاپۆرێکەوە کە لە پانایی گوێ دەریای شارەکە دا بوو . . دەیوت : لە پشکنینی شوێنی بڕانی هێڵی تەلگراف دەریایی بووینەوە ، خەریتەکانی قووڵایی دەری‌خست کە لە دووری (٢٦٦٠) مەترەوە بوە لێرەوە . . پێویستە بڵێین کە ئیستە (٣٠٠٠) مەترە لێرەوە دوورە ! . .

دووەم بروسکەنامە لە سەرۆکی شارەوانیەوە بوو کە دەیوت :

بەتەواوی ناتوانین‌و لەوە کەوتووین کە جڵەوی کاروباری شارەکە ڕاگرین ! . . ترس‌و گێرەشێوێنی سەرو بەری خەڵکی داگرتوە . . بەگورجی شتێ بکەن ! . . .

حاکمیش ویستی شتێ بکات ، بۆیە بروسکەیەکی لێدا : «واهاتم ! . . .»

بەژنەکەشی وت : لەگەڵما وەرە ؟ چونکە هاتنت لەگەڵما لەوانەیە شارەکە ئارام بکاتەوەو ، دڵنیایی بخاتەوە دڵی خەڵك ! . .

کەشتی حاکم‌و ژنەکەی بەرەو (سان‌پییر) کەوتە ڕێ ، لیژنەیەکی زانستیشیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرت لە هەندێ مامۆستایان کە هەندێکیان شارەزاو هەندێکیشیان ئەفسەری گەورە بوون کە لەوانە بوو بوونیان بۆ توندکردنەوەی جڵەوی گێرەشێوێنییەکە پێویست بێ . . بارودۆخی هەڵبژاردنەکە کەوتوەتە مەترسی‌یەوە ئەگەر دەنگەکانی شاری (سان‌پییر) کەم بنەوە . . . .

### وتەیەکی ڕۆژنامەیی

لە ڕاستی دا شارەکە بە گەیشتنی وەفدەکە ئارام بوویەوە ، ئەوانەی بەرەوکەشتی ڕایان ئەکرد نەختێ خاوبوونەوە ، ئەوانەی بە پەلە شت‌ومەکی

خۆیان کۆدەکردەوە راوەستان ئەوانەی بە کۆڵانەکاندا فرکان فرکانیان بوو دەستیان کرد بە لەیەکتر پرسین : مادام حاکمو ژنەکەی هاتن‌و ، ئەو زانایانەشیان لەگەڵ هاتوون ، بێگومان شتەکە ئەو مەترسیە زۆرەی نیە . . .

سروەی فێنکی دڵنیایی بەرێگەو باندا هەڵی کرد ، وەك تەوژمێکی زۆر ساردت کردبێت بە گەرووی دۆزەخدا . . . لێرەدا رۆژنامە نووسەکە لە رۆژنامەکەیدا ئەم راگەیاندنە رەسمیەی بلاوکردەوە :-

«شارو دەوروبەری سەلامەتن‌و ، لیژنە زانیاری‌یەکە دەستی داوەتە لێکۆڵینەوەی رووداوەکانو ، هەر ئەنجامێکی بۆ روون بێتەوە یەك لەدوای یەك بەخەڵکی رادەگەیەنێت . . . ، مەسەلەکە لەوە زیاتر نیە کە گرکانەکە چی‌خۆڵەمێشی تێدابوو فرێی دایە دەرێ . .»

تەنها گرکانەکە گوێی لەمانە بوو . . . لەگەڵ تاقە بەندی‌یەکەی بەندیخانەشدا . . . مامۆستای فیزیاش لەگەڵ خۆیدا خەریکی بۆڵە بۆڵ‌بوو ودەیوت : ئەمانە بێجگە رۆژی هەڵبژاردن شتێکی تر نابینن‌و . . .

ئەیانەوێ تائەو رۆژە خەڵکەکە لە شارەکەدا بهێڵنەوە . بۆ ئێوارەی حاکمو پیرەکەی میوانی سەرخوانی سەرۆکی شارەوانی بوون . . . رۆژنامەچی‌یەکەش وتاری دەرازاندەوە بۆ هێدی کردنەوەی خەڵکی‌و . . . ، حینجەی ناوی ئەندامە ئەناسراوەکانی لیژنە زانیاری‌یەکەی دەکرد !. . .

قەشەی کڵێسەش نوێژی بە (راهبة)کان دەکرد پاش ماندووبوونی رۆژی دان‌پیانان . . .

مامۆستای فیزیکی کونە دڵ‌بوویش دەیوت : (٣٢) قوربانی بەس نین بۆ ترساندنی ئەم کوێرانە ؟ ! . .

بەندی‌یەکەش لەناخی بەندیخانە تاریك ونووتە کەکەیدا ، تەنها چاوەکانی ئەو بوون لەو تاریکی‌یەدا دەبریسکانەوە ! . . .

دوو مانگی رەبەق لەوێ بردبوە سەرو چاوەروانی تەواوبوونی ئەو ماوەی دەکرد کە ماوەیەتی . . . نەیدەزانی چی هەیەو چی‌نیە ؟ ! . .

سەرلەبەیانی پێنجشەمووی مایسی (١٩٠٢)بوو ، چەند دەقیقەیەك پێش سەعات هەشت بەندی‌یەکە لە تەوژمی سووتێنەری ئەو هەواگەرمە خەبەری بوویەوە کە لە کلاورۆژنەی ژوورەکەیەوە خۆی کرد بە ژووردا ! . . .

هالاوە گەرمەکە دەست‌وپێی‌و دەم‌و چاوی سووتاندبوون‌و ، بۆن‌و بەرامەیەکی توندوتیژی گۆگردین لووتی کاول‌کرد ، لە رقاندا توندتوند بە هەر دوو دەستی بە دەرگاکەیدا دەماڵی :-

دەرگام لێ‌بکەنەوە ، خنکام ! . . .

لالایەوە ، هاواری کرد ، تووڕە بوو ، دەیلووراند ، هەناسەی هەڵدەکێشا ، دەیقۆڕاند ، دەوەری . . . بێ‌سوود بوو ، کەس وەلامی نەدەدایەوە ، چونکە کەس لەوێ نەبوو ، سێ رۆژ ئەمەکاری بوو .

رۆژی چوارەم وەلامیان دایەوە ، هەندێ سەرباز هاتن دەرگاکەیان شکاندو بردیانە دەرەوە بۆ سەر تەختی زەوی ، بۆ رووناکی . . . رووناکیەکە تاماوەیەك شەوکوێری کردبوو نەیدەبینی ، کە چاوی کردەوەو توانی ببینێ هیچی نەدی ، شار نەمابوو ! . . لە هەموو لایەك هەر لەشی مرۆڤ بوو رەش هەڵگەڕابوو وەك خەڵووز . . مامۆستاو . .

رۆژنامەچی‌و ، سەرۆکی شارەوانی‌و قەشەو هەڵپاڵێوراوی میری‌و هەڵپاڵێواروی دژی میری‌و حاکمو ژنەکەی‌و ئەندامانی لیژنەی بەرزیش ، ئەمانە هەموویان ، لاشەیان لە لاشەی (٣٢) هەزار لاشەی تر جیا نەدەکرایەوەو ، لە چارەنووسدا هەموو وەك یەك بوون ، تا ئێسقان رەش‌داگیرسابوون ، لێرەو لەوێ . . لە نێوان ماڵە کاول بوەکانداو ، لە ریگا بەگرو خۆڵەمێش‌و مەعدەنی تواوە داپۆشراوەکەدا . . .

هێشتا خەڵك ئەوەی رۆژنامەچی‌یەکەیان نەخویندبوویەوە کە بۆ دڵنیایی خەڵکی نووسیبوو . . .

سەرلەبەیانی پێنج شەمووی نەگبەت کەمتر لە پێنج‌ثانیە پێش سەعات هەشت . . دەرگاکانی دۆزەخ کرانەوەو ، لووتکە گرکانەکە تەقیەوە ، دەمی گرکانەکە بوو بە چەند دەمێکی ئاگرین ، لافاوی گرو ئاگر بە بەرزایی دەیان مەتر هەموو داوێنی تەپۆڵکەکەی گرتەوە . . . شارەکە خۆی‌و هەرچی تێدابوو ، هەرکەسی لێ‌بوو هەموویان بوونە یەك پارچە گری سوورو هەوری تەم . . تەنانەت کەشتی‌یەکانی گوێ دەریا هەندێکیان سووتان‌و هەندێکیشیان نوقمی بنی دەریا بوون ! . .

شاری (سان‌پییر) بە خۆی‌و بە (٣٢) هەزار دانیشتوویەوە لە مابەینی دوو هەڵبژاردندا لەناو چوو ! . .

پاش سێ رۆژ کە تیپی رزگارکەر گەیشت دەنگێکیان بیست کە لە ژووری بەندیخانەکەوە دەهات ، دەنگی لێدانێکی دزە تووڕەکە بوو کە تاقە بەندی‌یەك بوو لە شارەکەداو ، لەو شارەدا کە لەناو چوو بەخۆی‌و دانیشتووی‌و هەڵبژاردن‌و هیوای میری‌یەوە ، تەنها ئەو بەندی‌یە بەسەلامەتی دەرچوو . . . هەر تەنها ئەویش مافی دەنگ‌دانی نەبوو ! ! ! !

# زانستی مرۆڤ
# ئەنترۆبۆلۆجیا

روشنبیری نوێ وەری گێراوە

١ – وشەیەکە لە دوو وشەی یۆنانی وەرگێراوە : **(انثروبوس)** واتە مرۆڤ . و **(الوغوس)** واتە وشە یان بابەت و لێکۆڵینەوە . کەواتە ئەنترۆبۆلۆجیا یانی زانستی مرۆڤ .

بەلاّم لێکدانەوەو پێ ناس کردنی زانستی مرۆڤ زۆر فراوانە کە تا رادەیەك هەندێ زانستی تر دەگرێتەوە کە زانستی مرۆڤایەتی و جوغرافی و ئادەمی و مێژووی و کۆمەلاّیەتی و زانستی شارستانی یەت و دەرونی یە ، کە ئەمانەش هەموویان زانستی مرۆڤایەتین چونکە لە یەکێك لە لایەنەکانی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە .

لێکۆڵەرەوەکانی ئەم بوارە ئەنترۆبۆلۆجیایان ناو ناوە زانستی کۆمەڵگا دواکەوتوەکان . بەلاّم بەزوویی ئەم ناوە دوورخرایەوە چونکە خۆسەپاندنێکی بەسەر نەتەوەکانی پێشودا تیایە کە لەگەڵ گیانی زانستی و بەرنامەیەکی دانراوی دروستدا ناگونجێ .

لە لایەکی ترەوە جوغرافی یە ناسەکانی عەرەب لە ماوەی ئەم (٣٠) سی ساڵەی رابوردودا بەم زانستەیان وتوە لێکۆڵینەوەی ئادەمی کە ئەمەش ناوێکە نرخی خۆی هەیە چونکە وشەی ئادەم زۆر لایەنی سەرەتای و رەچەڵەکی مرۆڤ دەگرێتەوە .

**٢ ئەنترۆبۆلۆجیا : زانستێکە**

بەشێوەیەکی سەرەکی لە کۆمەڵگا سەرەتای یەکان دەکۆڵێتەوەو لەم روەشەوە زانای مرۆڤی ئەمریکی (م . وایت) دەڵێ : ئێمە لە بەکارهێنانی زانستی مرۆڤدا .

ئەوەندەی مەبەستمان لێکۆڵینەوەی مرۆڤی سەرەتای یە ، ئەوەندە مەبەستمان لێکۆڵینەوەی مرۆڤ نی یە . ئەمەش مانای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگا سەرەتای یەکان یان نیمچە سەرەتای یەکان دەگەیەنێ ، چونکە ئەو لێکۆڵینەوە پەرەدارەو پێشکەوتوە گرێدارەی مرۆڤ کە لە کۆمەڵی پێشکەوتوی ئێمەدا هەیە پێویستی و ئەرکی زانای مرۆڤ نی یە ، بەڵکو ئەرکی زانای کۆمەلاّیەتی یە .

جا کە ئەنترۆبۆلوجیا لە مرۆڤ دەکۆڵێتەوە لە دوو سوچەوە بۆی دەچێ ، یەکەمیان لەبەر ئەوەی بەشێکە لە سروشت یان دیاردەکانی سروشت لە کەوندا کە ئەم لایەنەش بابەتی ئەنترۆبۆلۆجیای فیزیقی یە کە لە پەیوەندی مرۆڤ و پێشکەوتنی بەچاو کۆمەڵگای ئاژەڵ و چۆنیەتی جیابونەوەی مرۆڤ لەگەڵ چەشنەکانی ئاژەڵی تردا دەکۆڵێتەوە کە مەبەستیشی لەمە دابەش کردنی کۆمەڵی مرۆڤایەتی یە بۆ چەند رەچەڵەکێکی ئادەمی و دەرخستنی ئەو بناغەی فیزیقی یە کە ئەو دابەش کردن و پێوەرەی لەسەر بنیات نراوە . بەلاّم دووەمیان ئەوەیانە کە مرۆڤ دەگرێتەوە ، وەك زیندەوەرێکی گیاندارو خاوەن عەقڵ و رۆشنبیری کە ئەمەش ئەنترۆبۆلۆجیای رۆشنبیری و کۆمەلاّیەتی یە کە هەردوکیان پێکەوە رۆشنبیری و رژێمە کۆمەلاّیەتی یەکان دەگرنەوە لە کۆمەڵگای ئادەمی جۆربەجۆردا .

لەرووی پێگەیشتن و پێشکەوتن و بلاّوبونەوەیانەوە هەروەها ئەو یاسایانە ئەدۆزنەوە کە هەموو ئەو دیاردانە ملکەچینی .

دواجار ئەنترۆبۆلۆجیای پراکتیکی (تطبیق) هەیە کە ئەمەش زانستێکە پیاوە سیاسی یەکان و زاناکان لە کاتێکا دەیانەوێ چارەسەری کۆمەڵگا سەرەتای یەکان بکەن و لەرووی کۆمەلاّیەتی جۆربەجۆرەوە پێشی بخەن هانای بۆ دەهێنن وەك چاككردنی یاسای فێرکردن و دادگەری و هۆی تەکنۆلوجیا لە کشت و کاڵ و کاروباری گشتی دارایی . جا لەبەر ئەوەی چەند پسپۆرێك لە بواری چەسپاندنی هۆی چارەسەرکردنی نوێی کۆمەڵگا سەرەتای یەکاندا هەیە کە لەرووی چەسپاندنی یەوە چاودێری لایەنە ئاینی و فیکری یە باوەکانی ناو کۆمەڵگا دەکەن کە ئەمانەش بەتوندی لە رێگای ئەو هۆیانەدا رادەوەستن .

- **ئەنسکلۆپیدیای سیاسی**

بەرگی یەکەم

بە سەرپەرشتی د .**عبدالوهاب الكيالى** . دەزگای لێکۆڵینەوەو بلاّوکردنەوەی عەرەبی بەیروت ١٩٧١ .

ئەنترۆبۆلۆجیا وشەیەکی یۆنانی یە مانای زانستی مرۆڤ دەگەیەنێ ، بەلاّم ئەم زاراوەیە لەوەشی وردتر بەکاردێ و مانای زانستی کۆمەڵگا سەرەتای یەکان دەگرێتەوە ، ئەمەش لەبەر

ئەوەیە کە بەشێکە لە سروشت‌و دیاردە سروشتی‌یەکان .

واتە زانستێکە پی‌گەیشتن‌و پێشکەوتنی مرۆڤ باس‌دەکات‌و لە کۆمەڵی ئاژەڵیان جیا- دەکاتەوەو بەپی‌ی بناغەی فیزیقی کۆمەڵگای مرۆڤ دابەشی‌دەکات بەسەر چەند رەچەڵەکی‌دا کە ئەمەش پی‌ی دەڵی‌ن ئەنترۆبۆلۆجیای فیزیقی هەروەها دەربارەی رۆشنبیری‌و چالاکی عەقلی مرۆڤ دەکۆڵیتەوە کە پی‌ی دەڵێن ئەنترۆبۆلۆجیای رۆشنبیری . لە لایەکی ترەوە لقێکی کە هەیە کە پی‌ی‌دەڵێن ئەنترۆبۆلۆجیای پراکتیکی کە لە کۆمەڵگا سەرەتای‌یەکان‌دا بەکاردەهێنرێ بۆ چارەسەر کردنی رژێم‌و یاسای پەروەردەو دادگەری‌و ئابوری .

●● فەرهەنگی زاراوەی ئەنترۆبۆلوجیاو فۆلکلۆر
دانانی ایکە هولتکراسی
دەزگای (المعارف) لە میصر
قاهرة ١٩٧٢ .

وشەی ئەنترۆبۆلۆجیا زانستی مرۆڤ دەگرێتەوە . بەلاّم لەبەر ئەوەی کە دوا ئامانجی زوربەی لێکۆڵینەوەکانی مرۆڤایەتی‌و زانستی‌دەرونی‌و کۆمەڵگا لەگەلّ لێکۆلینەوەی مرۆڤ‌دا وەك زانستێکی سەربەخۆ بوون بە ئەنترۆبۆلۆجیا بۆیە پێویستی بە پی‌ناس‌کردنێکی وردتر هەیە کە ئەمەیە ، لقێکە لە لێکۆڵینەوەی مرۆڤ کە لە روانگەی پەیوەندی‌و بەرهەمی مرۆڤەوە تی‌ی دەروانیّ لەگەلّ ئەمەش‌دا ئەنترۆبولوجیا لە زوربەی ئەوروپادا بیولوجیای رەگەزەکان یان ئەنتروبۆلوجیای سروشتی دەگرێتەوە ئەمەش لە ئاکامی ئەو دابەش‌کردنە بو کە لە رابوردودا بەسەر زانستی ئەنترۆبۆلۆجیای بەربلاّودا هات ، کە جیاوازی‌یەکی گەورەی لەگەلّ ئەم‌و ئەوی تردا هەیە کە کۆن لە فەلسەفەدا بەلّگەی زانستی دەرونی دەسەلماند .

شایانی باسە (لاوخد) یەکەم کەس بون کە لە سالّی ١٨٤١ دا بۆ یەکەم جال بە واتایەکی جیاناز لە ماناي سایکۆلۆجی پێشو بەکاهێنا کە بەم شێوەیە دەست‌نیشانی کلدبون : بابەتي ئەنثلن‌بۆلۆجیا لێکن‌ڵینەوەی اەن هۆیانەی دەلەوەیە کە ئەقلّ مل‌کەچي دەبی‌و ئەن گێران‌کاریانە دەست‌نیشان دەکات کە بەسەل عەقلّ‌دا دێت . ٧ . اەنەی گرنگە دیەکەم کۆمەڵەی اەنترۆبولۆجیا لە چلەکاني سەدەی لابولدودا دادمەزرێنراوە .

هەروەها ئەنترۆبۆلۆجیا بە مانایەکی زۆر فراوان لە ولاّتی ئەنگلوسەکسۆنی – بەتایبەتي لە ولاّتە یەکگرتنەکانی ئەمەلیکادا هەیە .

مەبەستی ئەنترۆبۆلۆجیاش تی‌گەیاندني ملۆڤە لەنێنان لێکۆڵینەنەی چەند لایەنێکی زانستی‌یەوە کە لەوانەیە جیاوازبن‌ن لەوانەشە پێکەوە بەسترابن کە یەك زانستی کنێیان دەکاتەنە ٧

هەروەها دوو بەشی سەرەکی ئەنترۆبۆلۆجیا هەیە کە بریتین لە زانستي سروشتي‌و رۆشنبیری کە لە بەشی دووەمی‌دا لایەنەکانی ئەنتوغرافیاو ئەنترۆبۆلوجیاو هەندێ‌جاریش – کە ئەگەر لی‌ی جیا نەبێ – شوێنەوارو فۆلکلۆرو زمانەوانی زانستی کۆمەلاّیەتی دەگرێتەوە . . جا لێرەدا لەوانەیە یەکێك بەتایبەتی دەربارەي هۆی کۆکردنەوەی ئەم لایەنانە بپرسێت ؟

هەروەها (لنتون) لە پی‌ناس‌کردنی‌دا بۆ ئەنترۆبۆلوجیا راستە کە دەڵیّ لەبەل ئەوەی لێکۆڵینەوەی مرۆڤ‌و ئیشەکانی‌بەتی بۆیە هەندیّ زانستی سروشتی‌و هەموو زانستی‌یە کۆمەلاّیەتی‌یەکانیش دەگرێتەوە بەلاّم زاناکانی ئەم بوارە بەپی‌ي رێکەوتنی نێوان خۆیان لایەنە سەرەکی‌یەکانی لە لێکۆڵینەوەکانیان بریتی‌یە لە لێکۆڵینەوەی ریشەی اادەمی‌و لێکۆڵینەوەي ژیانی اەو گەلانەی کە بە گەلانی سەرەتای ناسلاون .

بەلاّم لە راستی‌دا هەڵبژاردنی ئەم ناوەش کە وادیارە رەگەزپەرستی تیابێ لەوانەیە هۆیەکي مێژووی بێ کە دەبوایە ئەنترۆبۆلۆجیا وەك زانستێکي جیاجیا دەستی‌پی‌بکردایە کە بەم شێوە کەڵەکە کردنێکە هەموو ئەو بابەتانەی تیایە کە لە چلەکان‌و پەنجاکانی سەدەي رابوردنودا وا دادەنرا کە دەتوانیّ شارەزاییان دەربارەی مرۆڤ دەوڵەمەند بکات ئەمەش لەپالّ چەند لی‌زیادکردن‌و خستنەسەرێکی گرنگ‌دا هەر وا مایەوە .

ئەنترۆبۆلۆجیا لەگەلّ ئەوەی کە بابەتەکانی جۆراوجۆرن هەرواش، زۆر بەهێزن ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە هەمویان یەك ئامانجیان هەیە .

لەم روەوە (تاکس) کە یەکێکە لە زانا‌کانی لێکۆڵینەوەی ئەم بوارە رایگەیاند کە دان بەوەدا دەنیّ کە ئەم یەکگرتنە زیاددەکات‌ن کەم نابی‌و تا ئێستا لە هیچ جێگایەك‌دا رووی نەداوە وشەي ئەنترۆبۆلۆجیا بەربەست بکریّ لە کاتێکا زۆر جار بەپێچەوانەوە بەردەوام روئەدا بەهۆی نزیك بونەوەی دەوڵەتەکان لە یەکتری‌و باشترین بەڵگەش بۆ هۆی ئاکامێکی تەواوی ئەنترۆبۆلۆجیایْ نویّ پەیوەندی نێوان زاناکانە لە زۆر لایەنی جۆربەجۆری بابەتی مرۆڤ‌دا .

# لێزەر و پاشەڕۆژ

● تیشکی لێزەر یەکێکە لە سەرچاوە هەرە گرنگەکانی ووزە لە دواڕۆژداو هەر لە پەیدابوونی یەکەم ئامێری لێزەر لە ساڵی (١٩٦٠)ەوە تاکو ئێستا لێکۆڵینەوە لەمەر لێزەرەوە بۆ ئەوەی گشت بوارەکانی تری ژیانیش بگرێتەوە . هەر لە گۆڕیێەو بەردەوام فراوانتر دەبێتەوە . . ئەمەش بێگومان بۆ سەر رادەی پێویستیو گرنگی لێزەر دەگەڕێتەوە .

**ئەم تیشکە لە جۆرە تیشکەکانی تر لەرووی هاوبەشێتی تیشك‌و ئەو ووزە گەورەیەی کە هەڵی‌دەگرێت جیاوازە دەتوانرێ بە تیشکی لێزەر دووردە بچوکەکان کە لە میلیمەترێك کەمترن بهێنرێتە کایەوە ، هەروەها تیشکی لێزەر ئەتوانێ بەگوێرەی جۆری گازی بەکارهێنراو بۆ تیشکدان ، کە بە زۆری گازی خاو وەکو هیلیۆم‌و کریتۆن بەکار دەهێنرێت ، جۆرەها رەنگی سوورو سەنزو هی‌تر بدات . دیسانەوە لێزەر بە خێرایی تیشکی خۆر دەگوێزرێتەوە .**

**ئەم هەموو سیمەتە تایبەتی‌یانە وایان لە تیشکی لێزەر کرد کەوا ببێتە ئامرازێکی گرنگ لە زۆربەی زۆری پیشەسازی‌یەکاندا .**

**لە زۆربەی کارگەو کۆگاکاندا تیشکی لێزەر بۆ زانینی رادەی فرۆشراو لە شتومەك‌و ئەو رادەیەی کە لە کۆگاکەدا ماوەتەوە بەکار دەهێنن بێ‌ئەوەی پێویستی‌یان بە ژمێریاری ئەلەکترۆنی بێت ، ئەم راپۆرتەش تازەترین باسە دەربارەی لێزەرو تەنیا لە بوارەکانی دیاری‌کراودا ئەمانەن :**

**١ - پیشەسازی :**

توانراوە تیشکی زۆر ووزە بەرزی لێزەر لە کارەکانی لەحیم کردن‌و تاواندنەوەی کانو ئاسانکردنی کارەکانی دروست کردنی شێوە ئەندازیاری‌یەکانی پێویست بەکاربهێنرێت‌و توانراوە نەخشەی ووردی دیارکردنی ئەو هێزەی کە کانی بەکارهێنراو هەڵدەگرێت بۆ دروست‌کردنی شیشە ئاسن‌و بنیات‌نانی پرد بکێشرێت . هەروەها تیشکی لێزەر بۆ زانینی گشت نارێکی‌یەك لە بنمیچی بیناکان بەکار دەهێنرێت ، چونکە لە توانای لێزەردا هەیە هەموو جۆرە چەمان‌و خوارو خێچی‌یەکی ناسرۆشتی لە بیناکاندا پیشان بدات .

**٢ - کەرتی پزیشکی :**

باسە نوێیەکانی سەر بە مەسەلەی لێزەر بایەخێکی تایبەتی‌یان هەیەو بۆ یەکەم جار لە عەمەلیاتکردنی چاوو پرژاندنەوەی سوورە دەماردا ، بەتایبەتی ئەوانەی کە لەوانەیە ئەنجامی کوێربوون بەدەستەوە بدات . نەك هەر ئەمەو بەس بەڵکو لە ئەنجامی پێشخستنی‌و پەرەپێدانی لێزەرەوە ئەوە بوو کە لەباتی دەستگری پزیشکی لە عەمەلیاتی برین‌سازی‌دا بەکاربهێنرێت ، چونکە لێزەر توانای ووشك‌کردنەوەی تەیمانەی هەیە . هەروەها توانای ئەوەی هەیە وا بکات کە لە کاتی عەمەلیاتکردنی بن توێژی‌دا خوێن نەبێت . بەکارهێنانی تیشکی لێزەر لەجیاتی دەستگری پزیشکی‌ی دەبێتە هۆی کەم فەوتاندنی تەیمانەو هەر لەبەر ئەمەشە عەمەلیاتی لێزەر پاقژەو برینەکە پیس‌و بۆگەن نابێت ، چونکە لێزەر زۆر ووردکارەو توانای فەوتاندن‌و سووتاندنی تەنیا یەك شانەی هەیە .

پزیشکەکان بەو هیوایەن کەوا شێرپەنجە بەهۆی بەکارهێنانی لێزەرەوە لەناوبچێت‌و توانراوە جیهازێکی لێزەر دروست‌بکەن کەوا شێرپەنجەی شانە لە خوێن‌دا بدۆزێتەوەو لەناوی‌بیات بەبێ ئەوەی کار لە شانە تووش نەبووەکانی تر بکات . . جا لەبەر ئەمەیە دەبینین دەستکراوە بە بەکارهێنانی لێزەر بۆ سووتاندنی پەنامی شێرپەنجە لە جیاتی کۆبڵت ، چونکە کە ئاراستەی پەنامەکە دەکرێت یەکسەر شانە تووشهاتوەکان دەسووتێنێت . هەروەها ئەوەش دیارکراوە کەوا تیشکی لێزەر بەتەواوی پەنام لەناوئەبات بێ‌ئەوەی گومانی پیس‌بوونی بەجێ بهێڵێت کە زۆر جار دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی شانەی شێرپەنجەدار ، لە یەك‌گرتنەوەی شانەکانی تردا .

لێزەر لە مەسەلەی جوانکردنی‌شدا بەکاردێت ، چونکە هیچ پاشماوەیێك لەدوای عەمەلیاتی جوانکردندا بەجێ ناهێڵێت . تاکو ئێستا بەهۆی لێزەرەوە چەند عەمەلیاتێکی سەرکەوتووی هەمان بابەت بەتایبەتی لە دەم‌وچاودا کراوە .

**٣ زانیاری گواستنەوە :**

جیهانی ئەمرۆمان تووشی تەقەمەنی زانیاری دەبێت . یەکێك لە سیمەتەکانی ئەم چەرخەمان گواستنەوەی زانیاری‌یە لەنێوان ناوچەیەك‌و ناوچەیێکی تری جیهاندا .

جا تیشکی لێزەر لەم بارەیەوە دەور دەنوێنێت‌و بەهۆی لێزەرەوە توانراوە کەوا دەنگ‌وباس‌و وێنە بەخێرایی تیشك بۆ سەرانسەری جیهان بنێردرێت‌و رێگاکەش بەم جۆرەیە : کۆمپیوتەر هەواڵ‌و زانیاری لەسەر کاغەزی تایبەت چاپ‌دەکات . لەپاشان وێنەی رووبکردنەوە لەگەڵ دەنگوباسەکاندا دادەندرێن‌و جیهازی لێزەر بۆ خوێندنەوەی ئەم دەنگوباس‌و زانیاری‌یانە ئاراستە دەکرێت‌و ئەوسا بە خێرایی تیشکی رۆژ بۆ هەر ناوچەیەکی جیهان – کە بمانەوێ بۆی رەوان بکەین – دەنێرێت ، لەم لاشەوە جیهازێکی تر هەیە هەواڵ‌و زانیاری‌یەکە وەردەگرێت‌و ئەیکاتە پێل‌و دەخرێتە بەردەم کۆمپیوتەرەوەو ئەویش زانیاری‌و وێنەکان لەسەر کاغەز چاپ‌دەکاتەوەو ئەم هەموو کارانەش کەمتر لە خولێك کات دەبات .

جا بەم جۆرە دەتوانین نووسینێك لە هەر شوێنێکەوە بێ بە چەند خولێك چاپ بکەین . . .

بواری دووەمی زانیاری گواستنەوە بەهۆی لێزەرەوە لە شەریتی موگناتیسی‌یەوەیە کە بۆ تۆمار کردنی فیلمی تەلەفیزیۆنی – فیدیۆتێپ – بەکار دەهێنرێت . بەڵام لەبەر ئەوەی شەریتی موگناتیسی زانیاری‌یەکی کەم بە خۆیەوە ئەگرێ بۆیە ئەم جۆرە شریتانە پەسەند ناکرێن ، جا لەبەر ئەوە شریتی تایبەتی وەك هی ئیستای گۆرانی‌و موسیقا کە کۆمەڵێك زانیاری وێنەدار دەگرنە خۆوە دروست‌کراون‌و بەکاردەهێنرێن‌و لە کاتی ویستن‌دا شریت لە جیهازی پیشاندان‌دا دادەنرێت‌و جیهازی خوێندنەوە کە تیشکی لێزەر هەڵدەگرێت ئاراستەی دەکرێت‌و تیشکەکە زانیاری‌یەکانی دەخوێنێتەوەو ئەیان‌کات بە فیلم‌و لە تەلەفیزیۆندا پیشان دەدرێن .

هەروەها لێزەر لە بواری تەلەفۆنکردنەوە بەکار دەهێنرێت‌و ئاشکراشە کە ئێمە تەلی لە مس دروست کراو بۆ مەبەستەکانی تەلەفۆنکردن بەکاردەهێنین .

بەڵام ئەم تەلانە خێرایی قسەوەرگرتن‌و تەلەفۆن پێ کردنی دیاری‌کراوە . جا بەکارهێنانی لێزەر لەم رووەوە دەور دەبینێت ئەویش بەهۆی ماددەی (فایبەر کلاس) کە دووردەکانی بچووك‌و زراون کە دەتوانرێ مێلیۆن هێڵی تیا دابندرێ‌و ئەستوورایی لە بەشێکی سانتیمەترێك تێنەپەرێت . تیشکی لێزەر لە میان ئەم ماددەیەوە بە خێرایی‌یەکی یەکجار زۆرەوە تێپەر دەبێت ، جا بەم جۆرە ئاخاوتن‌و خێرایی‌یە گواستنەوەی پتەوتر دەبێ‌و دەشتواندرێ ژمارەی تەلەفۆن بۆ چەند هەزار جارێك زیاتر بکات لەوەی کە ئێستاکە هەیەو وێنەی قسەکەرەکانیش کە بەهۆی تەلەفۆنی لێزەرەوە ئاخاوتن دەکەن بەرامبەر یەکتری پیشان‌بدات .

هەروەها لێزەر لە بواری سینەمای سێ دووردە بەکاردەهێنرێت ، ئەمەش بەم رێگایەیە : تیشکی لێزەر ئاراستەی لاشە تەن دەکرێت‌و ئەو تیشکەی لە تەنەوە ئاوێنەدار دەبێتەوە ئاراستەی ئەو ماددە کیمیاوی‌یە دەکرێت کە لەسەر پارچە شووشەیەك‌دا هەیەو دەیترشێنێت ، بەم جۆرە وێنەیەکی لە سێ دووردە پێکهاتوو کە وەك ئەسلی‌یەکەیە دەکەوێتە گۆرێ‌و بەم رێگایەش دەوترێت – نیگاری بۆشایی – چۆنکە دەکرێ وێنەیەکی وەك – تەن – ەکە یان شێوەکە لە بۆشایی‌دا پەیدابێت‌و ئەگەر هات‌و پارچە شووشەکەمان شکاندو کرا بە چەند پارچە شووشەی بچووك بچووکی قەوارە جیاجیا تەماشا ئەکەین هەر پارچە شووشەیەك لە پارچە شووشە بچووکەکان وێنەی پێشو بێ کەم‌وکوری هەڵدەگرێت‌و سینەمای سۆڤیاتی لە ساڵی داهاتوودا یەکەم فیلم لەم بابەتەوە پیشان دەدات‌و کارکردنیش لە زانکۆکانی ئەمریکادا بەردەوامە بۆ هێنانەدی وێنەی رەنگاورەنگی بۆشایی بە بەکارهێنانی چەند تیشکی رەنگاورەنگی لێزەر .

**٤ – لێزەرو ووزە :**

دەتوانرێ ووزەیەك کە توانای هەزارەها جار لەووزەی ئەتۆم پتربێت بە رێگای خولێکدانی یەك‌بووی بهێنرێتەدی . چاکی ی ئەم خولێکدانەش ئەوەیە کەوا کەرەستەی سەرەکی لە سرۆشت‌دا زۆرەو دەتواندرێ بەهۆی هایدرۆجینەوە ئەم خولێکدانە بێتەکایەوە .

ئەم تێکەڵاوە خولێکداوەیەش دەبێتە هۆی دروست‌کردنی بۆمبای هایدرۆجینی کە ووزەیەك بەدەستەوە دەدات هەزارەها جار لە ووزەی بۆمبای ئەتۆمی زیاترە ، بەڵام خولێکدانی تێکەڵاوی پێویستی بە گەرمایی‌یەکی یەکجار زۆر هەیەو ئاسان نی‌یە ئەمرۆ لە بنکەکانی ئەتۆم‌دا بهێنرێتە کایەوە . جا بۆ ئەم مەبەستە ئێستا زانایان دەستیان بە دروستکردنی ئامێری تایبەت کردووە بۆ کۆکردنەوەی تیشکی لێزەر لە ناوچەیەکی بچووکدا بۆئەوەی گەرماییەکی یەکی زۆر کەدەگاتە سەد ملیۆن پلەی سەدی بە دەستەوە بدات‌و بۆ هەمان مەبەستی سەرەوە بەکاری بهێنن .

زانایان لە وڵاتە یەك‌گرتووەکاندا ئامێرێکیان بە ناوی – شیبا – کە گەورەترین ئامێرە لە جیهاندا دروست کردووەو بۆیان لواوە بە چەندین تاقیکردنەوەی سەرکەوتووی ئەم بابەتە هەڵبستن . بەم جۆرە زاناکان وا بۆ لێزەر دەچن کەوا تەگەرەی ووزە بۆ هەزارەها هەزار ساڵ چارەسەر دەکات .

لێزەرو جەنگ :

لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا لە وانە ئەو لایەنانەی کە بایەخێکی زۆر بە باس‌و لێکۆڵینەوەی لێزەر دەدەن وەزارەتی بەرگری‌و کۆمپانیاکانی تری کە کەرەستەی جەنگ بەرهەم دەکەن ، هۆیەکەش بۆ ئەو ووزە گەورەیەی کە لێزەردا هەیە دەگەرێتەوە . زاناکان بۆ دروستکردنی «تیشکی مەرگ» کاریان کردووەو چەند ساڵێکیش لەمەو پێش توانراوە تیشکێکی وا لە لێزەر دروست‌بکەن کە توانای تاواندنەوەی چەند سانتمەترە ئاسنی هەبێت . بەڵام زاناکان چەند کۆسپی

تەگەرەداریان هاتە ڕێگا . ئەویش هەڵمی ئاسنە هەڵم لێهاتووەکان بوو کە لە ئاکامی بەردەوامی بەکارهێنانی تیشکی لێزەر کە چەند سانتیمەترە ئاسنی دەهەڵاند دەهاتە کایەوەو رووبەرووی تیشکی لێزەر دەوەستاو لەکاری دەخست .

جا لێرەدا زاناکان بیری بەکارهێنانی جیهازێکی تری لێزەریان کردووە کە تیشك بەشێوەیەکی پچڕپچڕ بنێرێت و لە هەمان کات‌دا ئامێرێکی تر هەبێ کە رادەی ژێ وەربگرێ و لەپاشان گڕی لێزەر بخرێتە سەر شوێنە ناڕێکان و بیگەڕێنێتەوە ئەو شوێنەی کە جاری یەکەم گڕی لێزەری لێ دراوە تا لەئەنجامدا لە ئاکامی پەیدا بوونی گەرمایی‌یەکی زۆر گەورە ئاسن لەناو ماددەکەدا بتەقێتەوەو ئەمەش هاتە دی .

دیسانەوە توانرا تانکێك کە تۆپی لێزەر هەڵبگرێت دروست‌بکرێت بۆ ئەوەی هەر شتێك بکەوێتە پێشی بیتاوێنێتەوە .

هەروەها ئەمریکایی‌یەکان فڕۆکەیەکیان دروست‌کردووە ، ئەم تۆپە هەڵدەگرێت و ڕەنگە یەکێتی سۆڤێت چەکی پێشکەوتو تری لەم بابەتە هەبێت ، چونکە ئەمریکایی‌یەکان وا بۆی دەچن کە یەکێتی سۆڤێت ئەمەی هەیە چونکە هەندێ لە مانگە دەستکردەکانیان لە ئاسمانی دەرەوە تەقیونەتەوە ، دەڵێن هۆیەکەش بەکارهێنانی تیشکی لێزەری سەر مانگە دەستکردەکانی سۆڤێت بووە . جا لەبەر ئەوە ئەمەریکایی‌یەکان بیر لە هۆیە نوێکانی بەرگری تیشکی لێزەر لە مانگە دەستکردەکانیانەوە دەکەنەوە . . .

زانایان ئێستا خەریکی دروستکردنی چەکی لێزەرن و لەوانەیە - هەروەك دەڵێن دوای دە ساڵی تر ئەم کارەیان سەربگرێت - بۆ ئەوەی ڕێ لە ڕۆکیتەکان بگرێت و هەپرون بەهەپرونیان بکات .

لێزەر بۆ بەکارهێنانی پێوانی دووری و ئاراستەکردنی ڕۆکێتیش بەکاردێت و تانگی تازەش جیهازی لێزەر هەڵدەگرێت بۆ ئەوەی دووری ئارمانجی دوژمن بپێوێ و بیداتە جیهازی پێوان کە ئەویش بەپێی ئەم زانیارییەوە ڕۆکێت ئاراستەی نیشانەکە دەکات کە کەمتر لە خولێك دەخایەنێت .

هەروەها سەربازەکان جیهازی لێزەر بۆ پێوانی دووری ئارمانجی دوژمن بەکاردێنن بۆئەوەی بەرێگای جیهازی بچووکی پێوەر دووری ئارمانجە کە بزانن و ڕۆکێتی ئاراستە بکەن .

دیسانەوە هەندێ فڕۆکەی ئێستا - بۆمبای زیرەك - هەڵدەگرێ کە بەهۆی لێزەرەوە ئاراستە دەکرێت و دووری ئارمانج و خێرایی یەکەی دەپێوێ و ئەوجا ڕەوانەی ئامێری پێوەرەکە دەکرێت بۆئەوەی زۆر بە درشتی ڕۆکێت ڕۆکێت ڕوو لە ئارمانجەکە بکات .

دوای باسکردنی ئەو بوارانەی کە لێزەری تێدا بەکاردەهێنرێت پرسیارێکی گورج خۆی هەڵدەکوتێ و دەڵێ : باشە ئەی کێ لێزەری داهێناوە ؟ !

یەکەم ووتاری زانستی دەربارەی لێزەر بە ناوی دوو زاناوە کە ( شالو) و (رتاون) ن لە ساڵی ١٩٥٩ دا پیشان‌دراوە ، بەڵام ئەم دوو زانایە یەکەمین جیهازی لێزەریان دانەهێناوە بەڵکو ئەوەی یەکەم جیهازی داهێناوە کە پشتی بە تیووری هەردوو زانای نێوبراوەوە بەستووە (جیمس) ی زانا بوو لە ساڵی (١٩٦٠) دا بوو . . جا بەم جۆرە ئافەرینی داهێنانی جیهازی لێزەر بەناوی ئەم زانایانەوە بوو و گشت کۆمپانیاکان ڕێژەیەکی سەدی‌ی لە قازانجەکانیانیان دەدەنێ .

**خوێنەری بەڕێز :**

وڵامی ئەم پرسیارە لێرەدا نابڕێتەوە ، چونکە - کۆڵد-ی زاناش هاتە ناوەوەو نەك تەنیا داوای رادەی قازانجی کۆمپانیاکانی کردو بەس بەڵکو داوای ئەوەشی کرد کە ناوی ئەویش وەك ناوی سێ زاناکانی تر لە تەختەی ئافەرین بدرێت . ئەویش بەو پێیەی کە ئەو بۆ یەکەمین جار جیهازی لێزەری داهێناوەو لە ساڵی ١٩٥٧ دا دوو کتێبی لەسەر تیشکی لێزەر و چۆنیەتی دروست‌کردنی یەکەم جیهازی لێزەر داناوە ، - پاش ئەو (جیمس) دروستی کردووە - هەردوو کتێبەکەی بە وەزارەتی بەرگری ئەمریکایی داوە بۆ ئەوەی بە پارەو ئالەت و ئامێرەوە بۆ دروست کردنی یەکەمین جیهازی لێزەر یارمەتی بدات .

بەڵام وەزارەتەکە نەك تەنیا دوو کتێبەکەی بزرکردووە و بەس بەڵکو قەدەغەشی کرد کەوا جارێکی تر وەك ئەم باسانە بنووسرێت و لە لێزەر بکۆڵرێتەوە .

(کۆڵد)ی زانا ئەم هۆیە روون دەکاتەوە کە وەزارەتەکە بە مرۆڤێکی ناپەسەندو نارەوا لەو گەیشتبوو جا لەبەر ئەوە ئێستا داوای ئەوە دەکات کە ئەو بە یەکەم دۆزێنەری لێزەر دابندرێت و ئافەرینی داهێنانیش بە ناوی ئەوەوە تۆمار بکرێت .

هەرچۆنێك بێت لێزەر لە پاشە ڕۆژی داهاتوودا بوارەکانی ژیانی مەدەنی و سەربازی دەگۆڕێت .

# "کۆن" و "نوێ"

## لەتیۆریی دووفاکتدا

نووسینی : بایر یوهانسن

زانستە کۆمەڵایەتیەکانی ڕۆژئاوا — ئەوانەی کە گرنگی بە لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵات دەدەن ڕێککەوتوون لەسەرئەوەی ناوی «دووفاقی) لەم کۆمەڵگایانە بنێن ، لە ڕوویێکی تایبەتی‌یەوە لەگەڵ زانستەکانی ئابووری و کۆمەڵناسی‌و جوگرافیا یەکدیگیر دەبێ ، لەم دووایەیدا ئەم کەوانەش بەرەو زانستی مێژوو داکشا ، کە ماوەیێکی دور ودرێژ خۆی لەم جۆرە زاراوانە پاراستبو . مەبەستیش لە ووشەی «دووفاق»ئەو جیاوازی‌یەیە کە لە نێوان بەرەی کۆن ، (تەقلیدی)و بەرەی «نوێی» کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵات هەیە ، ڕەخنەگرتن لە کەموکوڕی‌ی مانای «نوێ» کردنەوە و «نوێ» لەم لێکدانەوە دوو فاقی‌یەدا هاتووچووی کردووەو منیش نیازخوازی ئەوە نیم ئەم ڕەخنەیە دووبارە بکەمەوە و مەبەستیشم نی‌یە لە ڕیزەوە کۆنە پەرستە بەشداری بکەم کە چاو لەهۆیە ئابوری‌یەکان دەپۆشێ‌و بایەخی ئەو جیاوازی‌یە مەزنانە کەم دەکاتەوە کە لەدەسهات‌و جۆرەکانی جموجۆڵی‌یە ئەقلی‌و دەروونی‌و جەستەیەکانی نێوان کەرتەکانی کۆمەڵی دەستبەسەرداگیراودا هەن ولە پاشان لێمان دێتە دەرێ و جارێ «نوێیەتی کەلەپور) یان «کۆن» دەدات مەبەستم ئەوەیە مەغریب بکەم بەنموونە وڕوونی بکەمەوە کە چۆن بەکارهێنانی مەفهومی «کەلەپور» Tradition و (نوێیەتی) Moderne وەك دوو مەفهومی ناتەباو دژبەیەك لە واقیع دا بریتی‌یە لە دانانی مەفهومی (کەلەپور) یا میراتی لە جێی مەفهومی مێژوو ئەمەیش لەمەودوا ڕونی دەکەینەوە ئەوە دەگەیێنێ مەفهومی میراتی کاری خۆی لە بواری زانستە کۆمەڵایەتیەکان ئەورووپی دا ببینێ بە پێی هەمان ئەو دەورانەی هەوڵیان‌دا کە یاسای بەرگری فەرەنسی لە بواری ساسەت‌دا بینێ .

بە پیویستی دەزانم — بەتایبەتی گەر کارەکە پەیوەندی بە مەسەلەی- دیالۆگی نێوان شارستانیەتەکانەوە بێ مەفهومی کەلەپور دەسنیشان‌کەین لە کاتی دیالۆگ‌داو پەیوەندی ئەم مەفهومە بە مێژووەوە ڕون‌کەینەوە بۆیە بەسەرپێیی کورتەی مەفهومی «کەلەپور» یا میراتی» لە سەدەی نۆزدە هەمدا باس دەکەم .

مەفهومی میراتی Tradition و پەیوەندی‌ی بە ڕابوردوو یا « بەردەوام بوون» الاستمرار Kontinuitat بە مانای هەڵوێستی خودی مێژووی وەدەست هێناوە لەگەڵ پەیوەندی بە مێژووەوە پاش شورشی فەرەنسی لە ئەوروپا گرنگیێکی مەزنی لە بواری مێژووو فەلسەفەدا ، یانی پاش هەرەس هێنانی ڕژێمی سیاسی و ئابوری‌و کۆمەڵایەتی کۆن .

ئێمە هەر لە سەرەتاوە دەبینین دوو مەفهومی دژبەیەك بۆ «کەلەپور» یا «میراتی» لە ڕووی یەکی‌دا وەستاون : مەفهومی یەکەمیان مەفهومی پاراستنی ئەو نەریت‌و بنەرەتانەی کە ئورستوکراتیەتی فەرەنسی ئالاکەی هەڵگرتبو . ئەمیش مەفهومێکە شێوازوبنیاتە میراتیە کۆمەڵایەتیەکان دەچەسپێنێ‌و بایەخی دەداتێ‌و پایە بەرزی دەبەخشێتە شەکل‌و بنیاتی‌و ئالای خۆی لە ڕووی گۆڕانکاری‌یە مێژوویەکانی ڕوداوادا ، بەرز دەکاتەوە ،

[redacted]

ئورستوقراتیەت هەر ئەو شەکڵە کۆنو سەرنگون بووانەی بیر دەکەوێتەوە بە تەنها بەرگی شەرعیەتی بە سەرادائە ماڵێ، لە واقعیش‌دا هەوڵی زیندوو کردنەوەی دەدات . .

مەفهومی دووەمی «کەلەپور» یا میراتی» مەفهومی بورژووای هەڵکشاوە ئامانجی ئەم مەفهومە ئەوە نیە دەست بەسەر ئەو شوختەدا بگرێ کە لە نێوان رژێمی پێش شۆرش‌و رژێمی پاش شۆرش‌دا هەیە، یا دیاردە بنەرەتیەکانی ناکۆکی‌یەکان بپۆشێ، هەروەها لافی ئەوە لێ‌نادات کە پیاهەڵدانی بزوتنەوەی مێژوو بکات کە بەپێی رەوتی خۆی‌و بەرێکوپێکی بەبێ گۆرانێکی گەوهەری بروات، بەڵکو هەوڵی ئەوە دەدات پشتیگری رژێمی پاش شۆرش بکات بەوەی کە میراتگرێکی شەرعی شۆرشە، ئەم مەفهومەش مێژووی دروست‌بوونی هێزە شۆرشگێریەکان دەگرێتەوە هەروەها پەیوەندی‌ی بە هێزە کۆمەڵایەتیەکانی دی دەردەخات، لە کۆتایش‌دا رەنگی هەموو دەربڕینێکی ئەدەبی‌و سیاسی‌و زانستی ئەداتەوە کە تۆوی شۆرشیان هەڵگرتووەو رێی‌یان بۆ خۆش کردووە، لە رێی ئەم کارە شۆرشگێری‌یەدا بورژوواکان خۆیان دەچەسپێنن‌و ناسنامەی خودی خۆی دەستنیشان دەکات . .

ئەرکی « میراتی» لە سەردەمێکدا کە بورژوا باوەڕی بە توانای خۆی هەبوو کە ئەمەکدارە بۆ بۆچون‌و ناوەرۆکی ئەم «میراتی‌یە» بریتی‌یە لەیەك گەیاندنی قۆناغی گۆڕانکاری شۆرشگێری‌و قۆناغی پەرەسەندن وپێشەوە چونی پاش شۆرشگێری‌یە — لێرەدا «میراتی» ئەستونێکی شەرعی‌یە بورژوا لە کاری خۆی‌دا شانی بەسەردا دائەدا، «میراتی» بەم شێوەیە پاڵپشت و دەنگی شەرعی‌یە بۆ خودی مێژوویی Hist Sugijekt کە لە تۆیەوە دەتوانێ مێژووی رابوردووی خۆی دەستنیشیان بکات وئەم مێژوەش بە پوختی لێ‌ی تێ بگات .

لە مەفهومی (کەلەپور) یا (میراتی) دا مەرجە کە سێ یا شەخسیەتێکی مێژوی لە گۆرێدا بێ بتوانێ دەستنیشانی هەموو باریکی مێژوویی خوی بکات ( سەرەڕای ئەوەی هەموو فەلسەفەکان کە روویان لەم رێبازە کرد کۆڵن‌و نەیانتوانیوە وێنەێکی خودی هەست پێکراوی دەرخەن . .

ئەم مەفهومە رەنگی ئەو هیوایە دەداتەوەو دەری‌دەبڕێ کە کەسایەتی مێژوویی پێشەوایی توخمی ئینسانی لە ئەستۆ بگرێ ئەویش بەپێ‌ی ئەم زانیاری‌یە بەرینە بەر بەرژەوەندی مرۆڤایەتی لە هەچ ئاستێکدایێ ئەو بەرپرسیاری‌یەی کە ئەستۆی ئەم (خودە) دایە ئەوەیە «مێژووی جیهان)دابرێژێ‌و وبەرەو رێ‌رەوی راستی‌خۆی پاڵی‌پێوەبنێ پێشکەوتنی توخمی مرۆڤایەتی لە بازنەی ئەم مێژووەدا مسۆگەر بکات .

مەفهومی «کەلەپور» بەم مانەیە راستی‌یەك یا ناوەرۆکێ یا تاك نی‌یە هەروەها جۆرێکی بێ‌وێنە نی‌یە لە جۆرەکان‌و چاویش لەو پەیوەندی‌یە بپۆشرێ کە لەگەڵ جۆرەکانی دی‌دا هەیەتی — ئەوەی کە هەمیشە لەمەدا مەبەستە کارێکە بۆ هەڵێنجانی خودی مێژوویی بۆ جۆرەکانی کۆمەڵ‌و دووبارە کردنەوەی رابوردوو و دەست بەسەرا گرتنی رۆڵی ئەم جۆرانەو گاری‌گەری‌یان و رادەی گۆڕیان بەسەر « ئێستا» ئەمیش بە هیچ جۆرێك ئەوە ناگەێنێ نۆچ بە ئێستا بدرێ بۆ رابوردوو . . هەرکە خود یا شەخسیەتێکی مێژوویی پەیوەندی وەرگرتن لە نێوان خۆی و جۆرەکانی کۆمەڵ‌و مومارەسەی رابووردودا بەست، چاو بەم جۆرانە بێنێتەوە و سەر لە نێو دابرێژنێتەوە ئێمە تەنها لەم حاڵەتەدا دەتوانین وەك بورژوا خۆش رەوکان بۆی چوون لە «کەلەپور» یا میراتی بگەین بەو شێوەیە کە رێ‌یەکە بۆ زامن کردنی ناسنامەی مێژوویی وەرسەن کردنی شێوەکان مومارەسەی «ئێستا» «کەلەپور» یا «میراتی» کە بورژوای ئەوروپی هەوڵی پاراستنی دەدات ئەویش بە کەوتنە دووی دەربڕینی سان‌سیمون Saint Simon، میراتی پێشکەوتن، بەڵام جی‌گۆرکێی بورژوا خۆی لە خۆی‌دا ئەم میراتی‌یە لەبار دەبا و لە ناوەرۆك روتی دەکاتەوە، دەنگ‌دانەوەی ئەمەیش لە لای هیگل‌و ئوجست کۆنتا دەبینین کە ناتوانن خۆیان بەم میراتیەوە بگرن بێ ئەوەی لێ‌ی کەم کەنەوە بەڵکو خۆیان لەسەر حسێبی ناواخن‌دا پێوەگرتووە، کە بانگی پێشکەوتن هەڵدەدەن لە هەمان کاتیش‌دا ئەمە ئاشکرا دەکەن کە کۆتایی بە کاتی قۆناغی مێژووی، بنیات‌نراو لە سەر زورانبازی دژایەتیەکان هاتووە . . .

ئاگای زانستی کەرتە ژێر رکێفی بورژواوە لەبەر چەن هۆیێکی دابڕەوە لە سەردەمی‌دا پێك‌هات : گرنگترینیان بەرزبوونەوەی چینی کریکار (برۆلیتاریا)و هەردوو راپەڕینەکانی ١٨٣٠و ١٨٤٨، پاشانیش بەرگری‌کردنی میللەتانی دەس بەسەرا گیراو لە رووی ئەوانەی کە خۆیان داناوە بە گەورە و بەرپرسیار لە رووی پێشکەوتنی جۆری بەشەری و خاوەنی بۆڕی شێوەکانی مومارەسەی بورژوا بۆ وە

ئاکام گەیاندنی پێشکەوتنی مێژووی جیهانی و پێشکەوتنی جۆری ئینسانی ، نەمانی باوەر بەبوونی ئێستا و پەیوەندیی بە سروشتی مومارەسەی رابووردەوە ، و چۆن ئامانجەکانی ئێستا سنوری هەڵوێستی خودی مێژووی دیاری دەکات لە کەرەسەکانی رابوردوو و ناواخنەکانی لە میراتیان لە ئێستاوە وە دەستی دێنێ . . ئەمەو گەرانەوە بۆ «میرات» بۆ خودی مێژوی مسۆگەری مومارەسەی ئەوە دەکات کە لە بۆشاییەوە دەرنەپەرن و بەردەوام بوون لەسەر بناغە . . و بەم شێوەیە «میرات» سیفەی پێوەر وەدەستدێنێ بۆ چاودێری رێرەوی مومارەسەی ئێستا . . وەلی مەفهومی یەکسانی لە مێژووی کۆندا شوخت دەخاتە چینیانەوە لە کۆتایش دا پەیوەندی لە نێوان رابووردو ئێستادا دەپسێنێ وەدەست بە سەر مەفهومی (میراتی) دا دەگرێ لەگەل داشکاندنی بیری پێشکەوتن لە عەملیەی مێژوویی دا .

دەبینین لیبولد فون رانکە Ranke لە ئەلمانیا وهیبولیت تین Taine لە فەرەنسادا دوو نوێنەری گەورەی ئەم مەذهەبە مێژوییەن و زیاتر کاریگەرن – لەگەلێ ئەوەی لە نێوانیان دا جیاوازیێکی گەوهەری هەیە ، یەك دەرگرنەوە لە دەسنیشانکردنی پێوەرو مەفاهیمی سەرەکی ئەم تیورە مێژوی یە نوێیە . . هەردوو ئینکاری پێشکەوتنی توخمی بەشەری دەکەن لە ریچکەی مێژوودا و دەگەنە جۆرە گوتەێك شێوەێکە لە نسبیەتی مێژوی کە ناتوانن لەسەر رۆشنای رایەکەیان دا مێژووی جیهان رون کەنەوە یا کارێ بکەن کە لێی بگەین لە چوارچێوەی ئەم تیورە مێژووی یە مومارەسەی عەمەلی دابرا لە زانینو لە نێوان میرات – ی و مێژوودا پەیوەندی نەما لەو کاتەوەی کە مەسەلەی میراتی– درا بە زانستی کۆمەڵایەتی ئەویش کەوتە دوی ئەم نسبیەتە مێژوی یە . . میراتی بەپێی سەرنجی ماکس فیبەر M. Weber لە ئەلمانیادا و دورکهایم Durkheim و لیفی برول Levy – Bruhl لە فەرەنسا ئەو مێژووەیە کە توشی راوستان و مەیین بووە ، هەر هەمان شەکلی دووبارە بووە بێ سەرپشك بوون و ئیرادە ، دژی بەرانبەر بە عەقلانییەتە لە نووسینەکانیان دا بنیات یا دەسکردی کۆمەڵگای دروست دەکەن زەنگی میراتی بداتەوە و بکرێ بە نمونەی رێکخستن و دەستەلاتی دەوڵەت و بەم شێوەیە « میراتی» لە هەمان کات دا دەبێتە مێژوی ئەم کۆمەڵگایەو خودی مێژوو یان . . ئاشکرایەکە پەیوەندی مێژووی لە نێوان کۆمەڵگا تەقلیدیەکانو ئەو ئوصولەی کە خود کەسایەتی ومێژووی هەیە ، بروژوازیەت توانای ناسینی هەموو هەلویستە مێژووی وکۆمەلایەنیەکانی هەیە و دەتوانێ هەلیسەنگێنیو ئاکامی ئەمەیش پاشکەز بوونی زانستی مێژوو لە (میراتی) ئەو میراتی یەی کە داوای هەڵویستی مێژووی دەکات و فرمانی مێژووی بەسەرا بدات لە باتی ئەوەی کە کەلەپوری وەستاو لەسەر هەڵسەنگاندن و فرمان دان دەرپەریوە ذاوای ناوەرۆکی یەکتالاکراو دەکات لە رووی روداوێکی مێژووی تاکدا . .

مێژوونووسی ئەدەبی ئەڵەمان «هلجە میلیتز» لە روی ئەم گۆرانکاری یە وتوویەتی :

(بەررەسی یە مێژووی و ئەدەبیەکان لەو کاتەوە وردە وردە دور دەکەونەوە لە مەسەلە گرنگەکانی سەردەم ، وایان لێهاتووە چاو لە کاکڵەی باسە زانستیەکان دەپۆشن بە نسبەت مرۆڤەوە کە «خودێکی» مێژوی یە . . مەبەستی سەرەکی بووەتە ئەوەی پەیوەندی بەرابودوو پەیوەندێکی مەوزوعی بێت راو مەزهەبی پسپورەکان وەپشت گوێ خراوە ( .لەپور) یا « پەند» کەوتووەتە ژێر رکێ « عەی مێژووی)[2] ئەنجامی ئەم ..یشر هێزە کۆمەڵایەتیە ئەستونیەکانی لێوەرگیراوە کە کاری بەسەر (ئێستادا) هەبووە بەم شیوەیە زانستی مێژو دژایەتی دوزییەوە لە نێوان (میراتی)و(مێژوودا) پەرەسەندنی کورت کردووەتە موتابەعەێکی ئاسایی بۆ واقع و مێژووی گەراندووەتە سەر زنجیرەێکی ساکاری بینراوەکان ، میلیتز ل ١٦١

بەم پێیە مێژو لە چەن سەردەمێکی یەك لە دوی یەکدا پێکهاتووەو هەموو ئەم سەردەمانا وەك «لیبولد» فون رانکە) بۆی دەچێ«یەکسانن لە رووی یەزدان دا» و لەسەر زانستی مێژووە بەم چاوەوە سەیری بکات ، بەم شێوەیە جڵەوی رژێم وفەرمان دان بە سەریا .بۆ خودێکە لە ژور مێژووە . . یالەپشتی مێژووە ئاشکرایشە ئەم خودە بێدەربەستە چ بە زۆر یا بە کەم لە روی کێشەی ئەم هەڵوێستەی لە ئاکامی کاریگەری بەردەوامی مومارەسەی مێژووی رابودوو .

بەم شێوەیە ودەەستهێنانی دەبێتە مومارەسەێکی بێگانە ، کارێکی خاڵی یە لە مانا مێژوونوس « وەك لاسایی کەرەوەی یەزدان» یا سروشت لە خالێك دا دەوستێ لە دەرەوەی هەموو کەلەپورێکە دەشێ بە پێی ئەم هۆیەش کەلەپوری هەچ کەسیکیش لە خۆگرێ ، لە ئێستا بە دواوە هیچ شتێکی لە ئەستۆدا نی یە جگە لەوەی خۆ حەشاردا ئاگادار بێ و دورکەوێتەوە و بێلایەن لەرووی هەموو سەردەمەکانی مێژوو بە بێجیاوازی ، رەنگ و سیمای ئەو

سەردەمەش هەرچۆنێک بێ . . دەبێ بێلایەن بێ . .

لەپێش‌دا دەستنیشانی (کەلەپور) یا (میراتی) بەوە دەکرا کە خودی مێژووی چەند سروشتی مومارەسەی میراتی وەدەستهێناوە تا لە بازنەی ئەم هەستەدا بەکارێکی موستەحیلی زانینێ . . بە هەر جۆر بێ مەفاهیمی « کەلەپور» یا (میراتی) ئەوە ناسەپێنێ کە بە یەکەوە ژیانی کۆمەلگایێکی تەقلیدی لە پاڵ رژێمی کشتوکاڵیو سەنعەتی و سەرمایەداری لە بازنەی یەکیەتیەکی هەرێم وروۆشنبیری و کۆمەلایەتی و نەتەوەی بێ‌ئەوەی کار نەکاتە سەر ئەو کۆمەڵگایە و گۆرانکارێکی بنەرەتی بۆ دروست نەکات . . بەلام دارشتنی ئەو تیورەی کە دەلێ دەشێ ئەم بە یەکەوە ژیانە بێ ، چون بەشی دارو دەستەی ئیدارەی ئیستعمار پاش سەردەمی نابیلون بووە ، هەروەها بەشی یاریدە دەرانی ئەم ئیدراتە لە زانایانی ئەنتولوژیاو ئەنثروپولوژیاو ئابوری بووە لە سەدەی بیستەم‌دا . . پاش ئەمانە زانستی ئابوری لە پەنجاکانی ئەم سەدەیەدا نمونەی کۆمەڵگا « دوو فاقیەکانی» دارژت ئم نمونەش تا ئیستا دەنستنیشانی بازنە گفتوگۆ دەکات لە سەر کێشەی پەرەپێدان و مەسەلەی ولاتە دواکەوتووەکان بەمە تەفسیری بنیات کۆمەلگاکان دەکرێ . . هەموو ئەو تیوارنەی باوەریان بەم نمونەیە هەیە تەسورێکی گشتی‌یان هەیە ئەویش کۆمەڵگاکانی جیهانی سێیەم لە دوو کەرت پێگ هاتووە ، کەرتێکیان نوێ‌یەو ئەوی دیشیان لاسای کەرەوەیە ، دەبێنێ هەموو پێشچونێکیش پێشچونی کەرتی نوێ‌یە لە سەر حسێبی کەرتە لاسای کەرەوەکەیە . .

ئەم نمونەیە مومارسە دەکرا لە لایەن دەسگاکانی ئیستعمارەوە پێش ئەوەی لە نیگای تیورەوە بۆ جیهانی بوون هەنگاو بنێ ، بۆ ماوەیێکی دورو درێژ پێش‌ئەوەی بوکە Boeke . فەرمانبەری کۆنی موستەعمەراتی هۆولەندی یەکەم نەخشەی تیوری کومەلگاکانی دووفاق ، دانێ (نەخشەیێکە پاشان پەرەی‌پێ‌درا لەلایەن هیجنز Higgens و بۆرجنسن Gorgensen وفای Fei و رایتز Rains وکیللی Kelley و ویلمبسون Williamson) و شیتام Cheetham . .

کاربەدەستانی موستەعمەرات لەئەندوسیاو رۆژهەلاتی ئەفەریقا و مەغرب ، مەفهومی کومەلگاکانی دوو فاقی لە شەکلی پروگرامێکی ئابوریا دارشت‌و لە وێنەی ئایدیولوژیەتێك‌دا کە پاکانە بۆ ئەو دەسبەسەراگرتنە سیاسی‌یە بەسەر ئەو ولاتانە بێنێتەوە ، ئەو هەولانەبی کە لە سەردەمی ناپلیونی یا درا وپاش ئەو سەردەمەش بۆ وە دووکەوتنی سیاسەتی ئیستعماری تێکەل هەموو نۆچیان‌دا لەسەدەی نۆزدەهەمدا بە هۆی بەرگری میللەتانی دەستبەسەراگیراودا ونەبونی هاندەری ئابوری لەلایەن کۆمەلگاکانی دەستبەسەراگر .

ئیستعمار لە کۆتای سەدەی نۆزدە وسەرەتا سەدەی بیستەم - بەتایبەتی ئیستعماری نیشتەجی‌یی لە ئەندەنوسیاو رۆژهەلاتی ئەفریقاو مەغرەب وێنەیێکی نوی‌ی بەیەکەوە بەستراوو سفت - ی بۆ ئیستعمار کێشا ئەویش وێنەی دووفاقی‌یە وتەفاوتی نێوان بزوتنەوەی مێژوی پەرەسەندو و ئەو ژماوە زۆرەی گومەلگاکانی تەقلیدی روانگەیێکی گشتی‌یە بۆ مێژووی جیهانی‌و ئەو رووەی کەرووی تی‌دەکات . .

ئیستعماری نیشتەجی‌ی ئەم دووفاقی‌یەی لە قالبی هەست پێکراونا کاتێ کە کۆمەلگای دەستبەسەراگیراوی کردە دوو کۆمەلگای لەیەگ دابراو کە هەریەکەیان لە هەرێمێکی جوگرافی دیاری‌کراوی یەك ولاتا دەژین هەروەها کردی‌یانیە دوولقی ئابوری هاوسی‌و لەژێر رکێفی دوو رژێمی ئیداری جیاوازدان لە هەمان کات‌دا لە ژێر دەسەلاتی فەرمانرەوایێکی مەرکەزی‌دان ، لەم دووفاقی‌یەدا رەنگدانەوەی دژایەتی لە نێوان مێژووی جیهانی‌و کەلەپوری تەقلیدی خومالی دەردەکەوی لەبازنەی دەولەتێکی جیهانی‌دا . .

ئیستعمار دەبینێ (جیاوازە لەگەل ئاینەکاندا کە زیاتر واقعی‌ترە لە نێو ئەم کۆمەلگایانەدا» ئەم دووفاقی‌یە بکاتە رژێمێکی نەگۆر بۆ دەسبەسەراگرتن وفەرمان . رژێمێ نەك لەسەر زۆران‌بازی وروبە وبۆنەوەی یەکدی بنیات‌بنرێ بەلکو لەسە سودو رێز لە یەکدی‌گرتن بێ . . لەم روانگە دووفاقەوە لیوتی Lyautey کومەلگای مەغربی دەبینێ ، مەغرب لە سەردەمی پاراستنی فەرەنسی دابەش دەکاتە سەر : مەغربی بەسود Marocutil ومەغربی پیویست یا بێ‌سود Marco indisp بەکەمیانی واتە مەغربی بەسود هەموو ئەو هەرێانە دەگرێتەوە کە بەرژەوەندی ئابوری راستی تیادایە (جی‌ی کشتوکال ، سەرچاوەی ئاو ، جەنگەل ودارستان وکان‌و شتی‌تر . .) وەلێ مەغربی دووەم واتە مەغربی پیویست ئەو شوێنە پیویستانە دەگرێتەوە کە لە رووی سوپاوە بەجی‌یە بۆ زامن‌کردنی ئاسایش وپەرسەندنی دەسهاتەکانی پێشو «بیدول Bidwell

لیوتی Lyoutey داوای هاوسەنگی‌یەك دەکات لە نێوان دەزگاکان وئەوکەسانەی پێشەوایی لەم دوو مەغربە دەکەن : (پیویستە قالبە کۆنەکانی پێشەوایی کۆن بەکار بێنین نەك لە ناوی بەرین دەبێ بە یارمەتی (وەزیری کۆن) Mandarin فەرمان بدەین ، نەك دژی ، ئێمە خۆ وا دەنوێنین لە ئێستاوە وتاسەر کەمایەتێیکی لاوازین نامانەوێ جێ‌ی «کەسانی» دی بگرین ناتوانین لە چاکترین کاتدا چ بکەین جگە لە سەرکردەیی وچاودێری بەولاوە) ئەو ئاکامەی کە لیوتی لە ئەنجامی تێ‌ڕامانی بۆ چۆنیەتی پەیوەندی لە نێوان رژێمی پاراستن ودەوڵەتی مەغربی و دوستانی مەغربدا پی‌ی گەیشتووە ئەمەیە (پیویستە خۆ دورگرین لە شێواندنی خووخدەو نەریت یا هەوڵدان بۆ گۆڕینی عادەت ، دەبێ تێ‌بگەین لە هەموو کۆمەڵگایەکدا چینێکی ئاراستەکراو ری‌ی بۆ خۆشکراوە حوکمرانی بکاتو ناتوانرێ هیچ شتێ بێ‌وان بکرێو چینێکی‌دیش بۆ ئەوەیە حوکمی بەسەرا بکرێ «ئامانجیش ئەمەیە» چینی حوکمران بخەینە ژێر خزمەتی بەرژەوەندیمان ١٣٢ Hermassi in Abdel-Malik, Sociologie .

لە هەمان‌کاتدا لیوتی بەرونی دەستنیشانی ئەوە دەکات کە مێژووی ئەم چەند کەسە تەقلیدیانەو دەزگاکانیان بەجێ نی‌یە دەرچی‌ێ لەوەی کە میراتێیکی ناو خۆیی‌و تەقلیدی نی‌یە ، هەروەها دەڵێ : هەموو بایەخی سەرەکیم دا بەوەی کە مەغرب وەکو خۆی بێ یانی لەسەر سیمای نوقم‌بووی ناوچەگەری بمێنێتەوە (بیدۆل ل ٢٠)

وابێ پیویستە مەغرب بەکەلك بێ بۆ بەرژەوەندی فەرەنسا بەتایبەتی بۆ بەرژەوەندی سەرمایەدارانی فەرەنسی ، وەکو سەمیر ئەمین باسی کاریگەری ئەمە دەکات ودەڵێ : (مێڵی سەرمایەداری فەرەنسی لەسەر ئابوری مەغرب بێ‌وێنەیە لە بەرین بوونەوەی مەوداو تێژرەویدا بۆ داچۆڕانە نێویانەوە . . (ئەمین ل ١٠١)

ئامانجەکانی بانکە گەورەکانی فەرەنسا ئەمانەیە :

**— پەرەپێدانی دراوەکەی بۆ ئیستغلال‌کردنی سەرمایەداری ریك لە کشتوکاڵو سەنعەتی‌و دەرهێنانی کەرەسە سەرەتاییەکانو لە پرۆژە سەنعەتەکانی دیدا کە لە پاش ساڵی ١٩٤٥ دا هاتەکایەوە .**

**— جۆش‌پێدانی بازرگانی دەرەوەو دەست بەسەراگرتیناو پێك هێنانی رژێمێکی بانگی بو یارمەتی و تەسلیف تا بتوانێ دەست بەسەر هەموو بووارەکاندا بگرێ ، پەرەپێدان بۆ وەجی‌هێنانی ئەم مەبەستە روی لەشارە گەورەکانو لەنگەگاکانو سەرچاوەکانی سامانی سروشتی گرنگ‌و کێڵگەکانی کشتوکاڵی بە پیت ، بەم شێوەیە مەغربی بەسود پێکهات لە لەپێدە شتەکانی مەراکشی رۆژئاوایی ولەو شارو لەنگەر گایانەی کەوتووەتە سنوری ئەم هەرێمە سەرباری (وجدە) Qujida پێویست بو بۆ زامن‌کردنی یارمەتی ئاوو توانا زنجیرە چیاکانی کشاوەرزانی بخرێتە ژێردەستەڵاتەوە ، لەبەر هەندێ کاری ستراتیژی لەسی‌یەکانی ئەم سەدەیەدا هێزەکانی فەرەنسا دەستی بەسەر خوارووی رۆژهەڵاتی مەغربا گرت ، بەم شێوەیە هەموو مەغرب بۆ یەکەم جار لە چەند سەدەیەکی بەر لەئێستاوە مل‌کەچی ئەم داگیرکردنە بو وکەوتە ژێر دەستەلاتێکی مەرکەزی هێزەکانی پاراستن رژێمێکی دراوی یەکگرتووی سەپاندە سەریان ،** وهەموو دابەش‌کردنێکی مەغرب تەقلیدی مەغربی هەڵوەشاندەوە کە گوایە ولاتی مەغربی مەخزەن ولاتی سیباو گۆڕیەوە بە «مەغربی بەسود» و مەغربی پیویست . .

رژێمی پاراستن وای‌بینی ئەرکی گۆڕینی بنیاتی کۆمەلایەتی و ئابوری بەستراوەتەوە بە «مەغربی بەسود» بۆیە بەپیویست زانرا زەوی وەدەست بهێنرێ بۆ بەرێوەبردنی ئیستغلالی ئیستعماری تایبەتی‌و گشتی وکاری‌سەرەکی دەوڵەتو دەزگا سەرمایەدارەکانی لەوەدایە فەرمان بەسەر کارەسەرەکی‌و بە بایەخەکان بدات تۆرێکی خزمەتگوزاری پیویست بۆ ئیستغلالی ولات دروست‌کات تا ئستیغلالێکی ئابوری تەواوی بکات .

بەلام (مەغربی پیویست) کارەکان لەوە کۆبووەوە فەرمانی چاودێری کردنی بەسەرا بسەپێنی وسەرشۆری باجی بکات کە بەدەرە لە ئیستغلالی سەرمایەداری هەرگیز رووبەروی گۆرانکاری رووبەروی سنوردار نابێ . ومەرجە «مەغربی پیویست» پێچەوانەی «مەغربی بە سودبێ» کۆمەڵگای مەراکشی لادێ نشینانی تەقلیدی .

بەم شێوەیە دوو ئابوری دراوسی‌ێ یەك خولقا کە لەیەك جیاوازن ، وجیاوازی یەکەشیان جیاوازی‌یەکی بەرینە لە «مەغربی‌بەسود» دا سەنعەتی ئاسن تووانەوەو کشتوکاڵ وبازرگانی لەسەرداو شێوەی لە سەردوا شێوەی رژێمی سەرمایەداریدایە وبە نوێ‌ترین ئامرازی بەرهەم‌هێنان دەخرێتەکارەوە ولە (مەغربی دیدا) کشتوکاڵ وبازرگانی‌و کارەکانی دی دەکەوێتە ژێر رکێفی رژێمە کۆنەکانی سەرمایەداری جۆرەکانی بەرهەم هێنان وەك سەردەمی سەدەکانی ناوەراست

دەمێنیتەوە ، بەم پیێیە دوو جۆر رژێمی فێرکردن رەنگی دابەش کردنی چینایەتی دەدایەوە لە هەر دوو کۆمەڵگاکەدا وهەروەها وەك پێویستیش دوو جۆر چاودێری وئیدارە پەیدا بوو .

– ئیدارەی ئیستعماری پەنای بردە بەر زامن کردنی ژیانی ئەم دوو رژێمە وهەروەها زامن کردنی ریێرەوی کاری نویێکردنەوە لە «مەغربی بەسود» دا وکۆکردنەوەی باج

– لە «مەغربی پیویست» وای کرد کە ئیدارەی ئیستعماری پەیمان لەگەڵ سەرکردەکانی عەشیرەت وخێڵەکاندا ببەستێ بۆ ئەوەی ئەم زەلامانە لە هەمان کاتدا بکاتە داردەستی خۆی یا نیمچە فەرمانبەر لە جیهازی ئیداریدا . . لیوتی پاکانە بۆ ئەم رێکخستنە ئیداری‌یە دەهێنتەوە بەو خاڵە بە ناو بانگە کلاسی‌کیەی ئیستعمار : رێز لە پەندی کۆن ورێز لە کەسانی پیشەوا بگرە کە نمونەی نەریتن دەتوانی زامنی دەس بەسەر داگرتنێکی بتەواوی پاراستن بە کەمترین خەرج بکەین . . «ئەمە زیاتر لەبارە بۆ رژێمی پاراستن ، زیاتر لە سەر خۆویە وهەروەها پیویستی بە کەمترین فەرمانبەر هەیە وکەمترین کاتیشی پیێ دەویێ سەرباری ئەوەی زامنی رێزگرتنی نەریت وخووخدەیان دەکات» بیدۆل ل ١٠٥

پاکانە بۆ رێزگرتنی نەریت نی‌یە گەر رادەی بەشداری بۆ زامنی دەستبە سەرداگرتنی بێگانە زامن نەکات بەرژەوەندی‌یە ئابوری‌یەکانی ئیستعمار وەجیێ نەهێنیێ «بیدول ل ١٠٥ – ١٠٦» فەرمانەکانی دەسبەسەراگرتنی پاراستن وەك لیۆتی دەڵی «وردەوردە دەسبەرداری سەرو کیێ گەورە دەبین» وەلیێ ناتوانین بە جاری دەسبەرداری بین تەنها لەو کاتەی‌دا کە بزوتنەوەکانی‌و وئەو نەریتانەی پاڵیێ پێوەداوە دژ بە .رژەوەندی ئابوری رژێمی پاراستن ئەوەستیێ . . (بیدۆل ل ١١٩) .

رژێمی پاراستنی فەرەنسی بە درێژایی ماوەی دەسبەسەراگرتندا نەریتی وەك شێوازی بەکار هێنا بۆ چەسپاندنی خۆی ، وەلیێ رژێمی پاراستن سەیری نەریتی نەکرد لە بازنەی پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتیە مەعمولی‌یەکاندا بۆ دەربرینی کەسایەتی مێژوویی بە مێژووی میراتی‌ی تیکچڕاو ولەم نەریتە نەگەیشت کە بنیات‌نەری پەیوەندی کۆمەلایەتی چرو وبە یەکا چوونی لە ئەستۆیە ، بەڵکو وەکو کۆمەڵیێ رودراوی جیا جیا سەیری کرد بۆیە هیچ چارێك نەبو بۆ هەرەس هێنانی ئەم سیاسەتە ئیستعماری‌یە وکەوتنیە نیۆ گێژراوی دژایەتیە گەورەکان ، وەك جاك بیرك J.Berque و عبد الله العروی پەردەی لە سەردا هەڵمالی ، سەرنج‌دان لە نەریت وەك میراتێك کە ئامرازیێ بیێ بۆ دەسبەسەراگرتن دەبیێ سەرنگونی ناوەرۆکی راستی‌ی بکات . . ئەم کارەی کە لە هەمو موستەعمەراتە ئەوروپیەکاندا رویدا .

دەشیێ بیری دابەش‌کردنی کۆمەڵگا بۆ دوو کەرتی کۆمەڵایەتی وئابوری سەربەخو کاریان بەسەر یەکدی‌یەوە نەبیێ ، دەشیێ لەسەرەتای رژێمی پاراستندا ئەم بیرە ماقولێ وبەجیێبوو بێت ، وەلی بەرزبوونەوەی ئابوری سەرمایەداری لەرۆژ ئاوای ولاٚت ولە ژوروی رۆژ ئاوایدا ودروست بوونی جیهازی ئیداری بە دویدا ، هەروەها گۆرانکاری لە هەموو هەرێمەکانی دیدا بووە هاو هەنگاویان کەوای کرد ناویان لەم هەرێمانە نا بە «کۆمەڵگای تەقلیدی» کە ناو لێنانێکی نامەنتقی‌یە . . سەرەرای ئەمەیش مەفهومی دووفاق لەپاش قۆناغی ئیستعماردا روو بەروومان دەبێتەوە وەلیێ لە دارژتنێکی دیدا ، نوێنەرانی بانکە جیهانیەکان دەریان بڕیوە وەهەروەها لەبەررەسی‌یە سەرەتاکانی نەتەوە یەكگرتووەکان دەردەکەویێ . . لایەنیێ لەم دووفاقی‌یە نویێیە ئەوانەش «میراتی» یا «میراتی رابوردوو» و «نویێ» وەلیێ ئەم دووفاقی‌یە دەسبەرداری بیری کاملێ بوون وبەرژەوەندی یەکدی لە نێوان «هەردوو لایەندا» بووە ، بیری هاودۆستی‌و هاوسیێیاتی وسەربەخوێی ئەلبرت وترستون A.Waterston لەم رووەوە دەڵیێ : رژێمی پاراستنی فەرەنسی بووە مایەی پێکهێنانی کەرتی کشاوەرزی وسەنعەتی وبازرگانی‌و ئاسن تووانەوە ، ئاراستەی بەرژەوەندی ئابوری فەرەنساکرا ، تا ماوەیێکی دوورو درێژ کەوتە ژێر دەستەلاٚتی ئەوروپیەکان ، ئەمەش لەپالێ کومەڵگایێکی مەغربی کشاوەرزی وسەنعەتی سەرەتایی وتەقلیدی هیچ پەیوەندێکی بە کەرتی یەکەمەوە نی‌یە» وترستۆن ل ٣ .

لێژنەی ئابوری سەر بەبانکی دەولی بەکورترو رونتر لە راپۆرتێکیا دەربارەی مەغرب دەڵیێ (ئەو پەیوەندی‌یەی ئابوری نویێ بە ئابوری تەقلیدی دەبەستێتەوە پەیوەندێکی پوچە ، پەرسەندنی ئابوری نویێ هیچ کارێکی گەورەی نەکردە سەر زۆربەی دانشتووان) (ئابوری ل ١٣ .

ئەم جۆرە بۆچوونانە هیچ بناغەیێکی راستی‌ی نییە «مەغربی پیویست» و «کۆمەڵگای لادی‌نشین – ی تەقلیدی» وەك لەم دواییەدا ئەم ناوەی لیێنرا لەگەڵ واقعی ئیشدا یەکدیگیر دەبنەوە لەگۆشەی جوگرافیای ولاٚتی سیبا ، یا هەریمەکانی ئەو عەشیرەتانەی کە باج بە دەستەلاٚتداری

مەرکەزی نادەن ، لە نێوان ئەم هەرێمانەدا جیاوازی لە شێوەی ژیان وکارکردندا هەیە سەرەڕای تەفاوتی حوکمی مێژوونوسان وزانایانی جوگرافیا ، هەموو عەشیرەتەکانی ئەم هەرێمە هەتا سەدەی نۆزدە هەم لەزور سیفاتا بەشدار بون . . ئەم لیستەیەی خواریش کامڵ نی یە بەقەد ئەوەی گرنگترین سیفات وتایبەتیەتی تا سەدەی نۆزدەم دەرخستووە : —

— هەموو هەرێمەکانی مەغرب تا ئەو ناوچانەی بەتەواوی لەژێر دەستەلاتی بەردەوامی دەستەلاتداری مەرکەزی بووە هەموو دیاردەی نەخۆشی (باثولوجیا) یان پێوە دیارە ئەم نەخۆشیەش لە سەدەکانی ناوەراستا بلاوبووەوە . لەگەڵ ئەمەشدا ئیشی بنیاتی دانشتوانی هەیە (دیموجوگرافیا) لوسیت فالنسی L. Valensie لەم رووەوە دەڵێ : کێشەکان یەك بەدوای یەکەوەن ماوەی نوێکردنەوە ولە بری‌دانان نادەن تەنها لە تووی نسبەتێکی بەرزی مەوالید —ەوە نەبێ (فالنسی ل ٢٥)

نوان Noin لەباسێکی درێژا کە دەربارەی دانیشتووانی مەغربی لادێ نشینانە لە قۆناغی سەرەتاییدا Archaisch بۆ مێژووی دانیشتووان لە مەغربدا دەکشێ تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم (نوان : جوزئی دووەم ل ٩٣ — ١١٦) .

— لەرووی ئەو قەرەباڵغیە نسبییەی لە هەندێ شوێنی چیاکانی جوتیاران‌و لە واحات دەبینین ناوچەکانی دی بە چاکی گرنگی پێ‌نەدراوە لە هەرێمەکانی ولاتی سیبا ، هەتا ئەگەر ئامرازی کشتوکاڵی جۆراو جۆریش بکەینە پیوەر دەبینین لەسەرەتای سەردەمی پاراستندا جۆرە هاوسەنگێکی تنسبی لەولاتی سیبادا لە نێوان دانیشتووان‌و سامانی سروشتی‌دا هەبو . . دەتوانین بڵێین ولاتی سیبا تا ئەو کاتە کێشەیٔ زیاد بوونی دانیشتووانی نەبو (نوان : جوزئی دووەم ل ٢٨٠ — ٢٩٣) .

— خێڵەکانی ولاتی سیبا ریککەوتوون لە جموجولی ئابوریدا سامانی سەرەکی لە ئابوریاندا «پەروەردەی ئاژەڵە» لە لەوەرگاکانی چیاکان لە رۆژ هەلات وخوارووی رۆژهەلات ، «کشتوکاڵ» لە چیاکانی جوتیاران‌و واحەکاندا . . بەدیهیە ببینین کشتوکاڵ لە هەرێمەکانی یەکەمدا بێ وپەروەردەی ئاژەڵیش لە هەرێمەکانی دوو هەمدا بێ» جیاوازێکی زۆر هەیە لە کشتوکاڵدا لە رووی پڕی‌و چرییەوە . . بەشێوەیێکی گشتی کشتوکاڵ چرترە لە چیاکانی جوتیاران‌و ناوچەی سوس واحاتەکان وکەمترە لە پیٔدەشتەکان بەلام جیاوازی تەقەنی وگەوهەری لە شێوەی بەرهەم هێنانی کشتوکالیدا لە مەغربا نی‌یە . .

— خێڵەکانی ولاتی سیبا باج نادا

— سەرکەوتنی عەشیرەتەکانی ولاتی سیبا وسەربەستی وەدەست‌هێنانی لەژێر دەستەلاتداری دەرەوەی بەردەوام کارێکی تەواوی کردە سەریان کە خۆ رێکخەن وبتوانن پەیوەندی بەشاران ودەستەلاتداری مەرکەزی‌یەوە ببەستن ، عەشیرەتەکان خۆیان سنوری پەیوەندی ئابوری وسیاسی بەشارانەوە دەست‌نیشان دەکەن هەروەها پەیوەندی دراوی خۆیان بەشارانەوە دیاری دەکەن دەتوانن پەرە بەم پەیوەندی‌یە بدەن یا بیبرن ئەویش بەپێی پیویستی ، ئەمیش خاڵێکە لاوازی شاران دەردەخات ، وبەشێکی بچوکن بەنسبەت تێکرای دانیشتووان (٩ لە سەدان) .

— زۆربەی عەشیرەتەکان بەشداری جیهازی سیاسی دەکەن ، لەم ریکخستنەدا دۆخێکی حکومی نیەو جیهازێکی بیروقراتی دەستی بەسەر دەستەلاتداری‌یەوە گرتووە ، عەشیرەتەکان پەرەیان بە رژێمێکی ئالۆز داوە بۆ دابەش کردنی دەسەلاتداری وزامن کردنی بوونە نوینەر لە کەسانی عەشیرەت وبەشداریان لە هەموو بریارە سیاسیەکان کە گرنگە بۆ عەشیرەت . بەلام ئەم رژێمە زوو زوو توشی هەرەس دەهات وسیمایشی پاراستنی هاوسەنگی بو بۆیە ئاسان بو کەسێك بەپاڵپشتی پیاوانی خۆی کار بکاتە سەر دەستەلاتداری‌یەوە خۆی بکاتە سەرۆك عەشیرەت یاسەرۆکی چەند عەشیرەتێ بەهەرحاڵ — لەبەر نادیاری هۆ — رژێمی سەرکردایەتی تاکەکەس لە خوارووی ولاتدا ولەسەدەی نۆزدەهەمدا گۆرا بۆ رژێمی میراتی‌و خۆسەپین لەگەڵ ئەمەشدا زۆربەی هەرێمەکانی ولاتی سیبا مل‌کەچی رێکخستنی سیاسی کۆنە — کە باسمان کرد .

ئەم شەش سیفەتەی باسمان کرد نیشانەی کۆمەڵگای خێڵەکیانەی مەغربی بو لەسەدەی نۆزدەهەمدا ، گەر سەرنجی کۆتایی پاراستن دەبینین پینج لەم سیفاتانە وەکو خۆیان ماونەتەوە وشەشەمیان گۆران بەسەر ناوەرۆکی کۆمەلایەتی‌و ئابوری یا هاتووە .

پێویستە «مەغربی بەسود» کاری دروستی بۆ بکری تادەست بەسەر سامناکی درمەکاندا بگرێ وزامنی ژیان بکات لە شاران وبێ‌دەشتەکاندا ، دەبێ ئەم کارانە لەسەرتاسەری ولاتدا بکرێ وبێ‌گومان زۆری کارە دروستەکان لە

(مەغربی بەسود) دابو وزیاتر کاریگەر تر بو لە ناوچەکانی چیاکان ولەخواروو ، بەلام نسبەتی مردووان بەرز دەبووەوە . . نوانە Noin لەم رووەوە ئەلێ : سەرباری کەم دروستی بەیانات وسەرژماردن ، راستییەکی نەگۆڕ هەیە ئەویش خەلکی لادێ بە هاوسەنگی روو بەروو مەرگ نانبەوە ، ئەو زەبرەی بەر هەرێمێکی دیدا (نواند ل ٧٧)

بەهەر جۆرێ بەهۆی «قونصل»ەکانەوە جیهازی تەندروستی گشتی دامەزرا وپاشانیش بەهۆی رژێمی پاراستنەوەکاری کردە سەر بنیاتی نەخۆشی (باثولوجیا)ی مێژوویی کومەلگای مەغربی وبنیاتی دانیشتووانی گۆڕی «دیموجوگرافیا» نسبەتی مردووان کەمەوە بوو لەدایك بووان بەرەو زیاد بوون کشان «نوان ل ١١٥ ١٢٧» لە هەرێمەکانی سیبا (لەژێر ناوەندەوە) جگە لە لادێکان .

تەفسیرمان هەرچۆنی بێت بۆ ئەم بنیاتی دانشتووانە ، دلنیاین کە بەتەواوی جیاوازی لەگەل بنیاتی دانشتووانی کۆن کە کومەلگای مەغربی جیاوازێکی لەم رووەوە هەبو ، بنیاتێکی دانیشتووانی نوێیە بەو مانایە کە مەغرب پێش ئەم سەدەیە ئەمە بەخۆوە نەبینیوە .

ئەو ئەنجامەی لەکۆی ئەمانەوە وەدەست هێنرا پەیوەندی دانشتووان گۆرا لەگەل سەرچاوەی سامانی سروشتیدا . . ناتوانرێ باسی کەمی دانیشتووان بکرێ تەنها لەلەوەرگاکانی چیاکاندا وتەپۆلکە بەرزەکانی رۆژ هەلات نەبێ – واتە ئەو هەرێمانەی دەژین لەسەر پەروەردەی ئاژەل . . بەلام چیاکانی جوتیاران وواحەتەکان ئازاری زۆربەی دانیشتووانی هەیە (نوان ل ٢٨٨ – ٢٨٩) هیچ شتێك لەبەردەم دانیشتوواندا نەماوە لەروی ئەم مەینەتە ئابوری‌یە جگە لە کۆچ کردن بوکار لەئەوروپا یا کوچ‌کردن بۆشارانی مەغرب . . هەروەها بنیاتی جموجولی کاریش گۆڕا سەرچاوەی ژیانی ٢٠٪ لەدانیشتووانی جوتیار وشوانکاران گۆڕایە سەر شتی دی لەبری کشتوکال وپەروەردەی ئاژەل لەپال کاری دەستی‌یەوە کە لە مێژە لەدێهاتەکانی مەغربداباو بووە رووی نوێی کاری دی لە کەرەتەکانی بازرگای وخزمەتو ئاسن‌توانەوە وکان و بنادا دەرکەوت (نوان – ل ٢١٤ – ٢١٥ – ٢٢٩ – ٢٣١ –

لەمانە گرنگتر ئەو پەرەسەندنە راستەو خۆیەی کەوتە سەر کشتوکالی (تەقلیدی کشاوەرزی«تەقلیدی» ئەورۆ هاوشانی کشاوەرزی سەرمایەداری‌یەو بەسەریشیا زالە لەرووی بەرهەم هێناندا زامنی بەشی بەشدارانی دەکات پێش سەردەمی پاراستن زەوی یەکانی ئەو بێستانانەی بەدەوری شاران‌و وئەو شوێنانەی خەلکی تیادەژێ لەکۆنەوە لەولاتی سیبادابەرزترین موعەدەل بەرهەمی کشتوکالی ئەدا بەدەستەوە ، ئەو شێوانەی بەکار دەهێنرا بۆ بەرهەم هێنان زۆربەی خەلکی بەکاری دەهێنا بەلام ئێستا ئەو ناوچانەی کە کشتوکالی بەشێوەی کۆن تیادەکرا شێوەکەی ون‌کردووە لەرووی باری ئابوری‌و کۆمەلایەتیەوە بووەتە کەرتێ لەپەراوێزدایە ، شێوەکانی بەرهەم هێنان جوارجۆر بووە وەدەستهات کەم بووەتەوە گەر بەراورد بکرێ لەگەل کەرتی کشاوەرزی نوێ لەمەغرب‌دا کە پەنا دەباتە بەر ئامیر وری‌ی‌نوێ‌ی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری چڕ . .

ئەم گۆڕانکاری‌یە لەباری سەرنجی منەوە هەلویستێکی نوێ‌یە (زۆرتر نوێ‌یە) ئەو سەردەمە گوزەشت خێلەکان لەباج‌دان سەرکێشی بکەن ئیدارەی پاراستنی خێلەکان بەزۆرەملێ باجیان لێ وەردەگرێ ، مەغربی سەربەست ئەم زۆرەملی‌یەی پاراستووە ، ئەوەی پەیوەندی بەناردنی بەرهەمی زەوی‌یەوە هەیە بۆ شاران هەروەکو خۆیەتی بەتایبەتی لەپێ‌دەشتەکان‌دا وئەم دیاردەیەش لە لەوەرگاکانی چیادا هەیە ، نیشتەجێ‌بوونی دانیشتووان بووە هۆی پەیدابوونی مولکیاتی گەورە . .

چیاکانی جوتیارەکان ئائیستا سەرکەوتوون لەپاراستنی بنیاتی کشتوکالی خۆیان کە لەسەر مولکیەتی بچوك ویەکسانی‌یە بەلام دەسهاتی جێگۆڕکیو کۆچ کردنی کرێکاری زیاتر لەدەستهاتی کشتوکالی وپەروەردەی ئاژەل ، لەم هەرێانەدا بنیاتی کۆمەلگای هەرەمی نوێ دەردەکەوێ . .

نوان بەدرێژی باسی ئەم گورانەی کردووە لەناوچەی (ئەنتی ئەتلەسی رۆژئاوای) کەگومانی تیادانیە بەزۆرەملی باج وەرگرتن وەدەرکەوتنی بنیاتی کۆمەلگای هەرەمی نوێ لەلایەك (لەئەنجامی کارو بازرگانی لەشاراندا تایبەتیەتی نوێ بو کۆمەلگای لادێ‌ی دروست دەکات ، کە دەبێ شێوەی مێژووی کۆنی هەرێمەکانی سیبا بگۆرێ وخۆی لەرێ‌ی خودی خۆیەوە دەبەستێتەوە بەشاران ولادێ . .

ئەوە نەما خێلەکان سنورلۆ پەیوەندی دانین لەگەل شاراندا ، دەسەلاتداری مەرکەزی دەستەلاتێکی تەواوی بەسەر لادێ‌کاندا هەیە ، هەمیشە خێلەکان لەژێر رکێفی یاسادان ، خێلەکان پشتیان بەو دەسهاتە بەستووە کەلە .

شارانەوە بۆیان دێ بەڵکو ژیانی خێڵەکان بەنە بەکۆچەری کاتی یا هەمیشەییەوە ، لەکۆتاییدا دەوەستێتە سەر بوونی یەکیەتێکی سیاسی گەورە لەسنوری هەریمەکان بپەرێتەوەو ماوەی سەربەستی هات‌وچوو گۆرینەوە لەنێوان هەرێمە جیاوازەکان وشارو لادێدا ، کە ئەورۆ رادەی پەیوەندی سیاسی‌و ئابوری نێوان شارو خێڵەکان دیاری دەکات ، ئەویش ئابوری شارە وئیدارەی شارو دەستەلاتداری مەڵبەندی‌یە لەشاردا . .

پەیوەندی‌یە مێژوییەکەی نێوان شارو عەشیرەت گۆرا ، ئەو کەلەپورە کۆنەی کە خێڵەکان بۆ ماوەیێکی زۆر لەولاتی سیبادا پاراستوبویان ، هەرەسی هێنا ، ئەویش کەلەپوری داناپیانانێکی کەمە بەدەستەلاتداری مەڵبەندی ئەو بناغەیەی لەدەس‌دا کەلەئەنجامی بزوتنەوەی شارستانیەت وپەرەسەندنی فەرمانبەری وەدەس هێنرابو . . پەیوەندی‌یە مێژوویی‌یەکانی نوێیانە بدەین کە شاری بەلادێوە بەستووەتە ، سەیر دەکەین زۆر زەحمەتە باسی کۆمەڵگای (تەقلیدی) مەغرب بکرێ . .

لەرووی گۆرانکاری لەپەیوەندی نێوان شارو لادێدا ، گۆرانکارێکی سیاسی‌و ئابوری وکۆمەلایەتی لەبنیاتی هەرەمی خێڵەکان‌دا هەیە هەروەها گۆرانکاری تر لەپەیوەندی خێڵەکان بەدەوڵەتەوە سەری هەڵداوە ، ئەو ئیداری‌یەی خەریکی ریکخستنی ئیدارەی خێڵێکی دیاری‌یە لەلایەن دەوڵەتەوە ، ئەو قازی‌یە کە کێشەکان لەنێوان خێڵەکان‌دا سوك دەکاتەوە لەشارەوە هاتووە . رێکخستنی خێڵەکی سیاسی کۆن رێی خۆش‌کرد بۆ ئیدارەی مەڵبەن‌دی . . مۆنتانیو دەڵێ :

Montagane (هێدی هێدی خێڵ بەرەو مرون دەچێت لەکاتێك‌دا کە دەوڵەتی نوێ پێك دێ) بیدۆل – لێ)

یاسا ئیدارەی جووت کە پاراستنی پێك هێنا هەڵوەشایەوە لە سالی ١٩٥٦ ، پەنایان بردە بەر سەرکردەکانی خێڵەکان کردیانە نوێنەر لە دەستەلاتداری مەڵبەندی ، بۆ دەیان پیاوە ماقوڵەکان دەستەلاتی سیاسی وئیداری‌و سەربازی‌یان لەنێو خێڵەکان‌دا بەخشی ، کە لەوەبەر ئەو جۆرە دەستەلاتەیان نەبووە . ئاکامی ئەمەیش بووە هوێ ئەوە نوێنەری خێڵکان لە خێڵی خۆیان دورکەونەوە ، زۆری پێ‌نەجو بوونە گەورە پیاوانی لادێ ودەستیان بەسەر زۆربەی زۆری داهاتەکان دەگرت‌و ئەو رۆیش کاری گەورەو ناوەن‌دی‌یان لەدەستە لەوەزارەتی ناوخۆی‌و سەربازی‌و پۆلیس ئەم بەشەیش بەشداری ژیانی سیاسی دەکەن لەسەر ئاستی ولات ویستی . . لەگەڵ نزیگ بوونەوەی گەورە پیاوانی لادی ودەستە لاندارانی مەلبەند لە شارستانیەت‌دا دەبینین جیاوازی کۆمەلایەتی لە نێو خێڵەکەدا بۆیە بنیاتی هەرەمی خێڵ – ی (نوێ) هەروەها بزوتنەوەی گەورە پیاوانی سیاسی بزوتنەوەیێکی (نوێیە) .

بە کورتی کومەڵگای مەغربی کە ئەو رۆ بەکومەڵگایێکی تەقلیدی لە قەلەم دەدرێ گەر بەراورد بکرێ لەگەڵ کومەڵگاکانی سەدەی نۆزدە هەم بەپێی بنیاتی دانشتووانی « دێموجوگرافیا»ی نوێ وبەگۆرینی پەیوەندی لە نێوان دانشتووان‌و سامانی ئابوری ولەنێوان شارو لادێدا ئەویش بەوەی بەزۆرە ملی باجیان لێ دەسێنن وکەوتونەتە دوای ئابوری ئیداری شارەوە ورێکخستنی کۆمەلایەتی وسیاسی لە نێو خێڵدا ، بنیاتێکی هەرەمی نۆی هاتە کایەوە لەبوی ئەوی دێ‌دا ، پۆپەکەی پەیوەندێکی بتەوی بە دەسەلاتداری مەڵبەندی‌یەوە هەیە ، ئەو شتەی کە لەسەر دۆخی خۆیدامایەوە بزوتنەوەی ئابوری بنەرەتی‌بو ، لە کشتوکاڵ وپەروەردەی ئاژەڵ تائێستایش بەپێی شێوەی بەرهەم هێنانی کۆن لەکایەدایە سەرەرای ئەمەیش ناوەرۆکی کۆمەلایەتی و ئابوری‌یەکەی گۆرا . . وەسفی ئەم کۆمەڵگایە لەنێو کۆمەڵێ کۆمەڵگای «تەقلیدی» ئەمە شارەزایانی بانقەکان دایان ناوە ئەویش لەروی سەرنجی ئابوری وسەرمایەداری‌یەوەیە .

لە مەغرب‌دا کۆمەڵگای تەقلیدی نی‌یە بەڵکو نەریتی جۆراو جۆر لە کۆمەڵگای مەغربدا هەیە ، نابێ ئەم نەریتانە بژمێردرێت بەراستی دابراو بەوەی کە پەیوەندی‌ی ومەرجی مێژووی پاڵ‌دەداتە مومارەسەی خودی مێژوی ناشێ فەهمی کەلەپور یامیراتی‌وا بکرێ کەدژ بە بزوتنەوەی پەرەسەندنی مێژویین تەنها ئەگەر فەرمانمان بەسەر ئەو کەلەپورە یا (ئەم نەریتەوە) بە بەرپەچدانەوە بێ لە بۆتەی پەرسەندنی جیهانی‌دا ولە چوار چێوەی مێژوی هەریمایەتی جیامان کردەوە کەلەپور ونەریتی میراتی پەیوەندی مێژوویان بەمومارەسەی ئێستای خودی مێژووی‌یەوە هەیە ئەویش لە مومارەسەی رابوردوودا کەناتوا نری بەکار بهێنرێ بۆ سەپاندنی دەسەلاتی رابوردوو بەسەر ئێستادا . .

لە گۆڤاری (فکروفن) ژمارە ٣١ سالی ٩٧٨ وەرگێردراوە .

# بزوتنەوەی بێلایەنو

# ئابووریی جیهان

لەو کاتەی شەڕی دووەمی جیهانی ڕاگیراو کۆتایی پێهاتنی ئەم شەڕە ڕاگەیاندرا ، کە لە ئاکامیەوە ئادەمیزاد شیلەی جۆرەها تفتو تاڵیو دەردەسەرییو وێرانکاریی هەڵمژی ، جیهان بەگشتی یەوە ، بۆ ئاراستەکردنیو پێشوازیکردنی قۆناغی نوێو ئاییندە ، دەستی لە سینەی دا ، دەوڵەتانی جیهان ، بەتایبەتی وولاتانی تازەپێگەیشتوو چاویان دەبڕیە پاشەڕۆژێکی گەشەدارو ژیانێکی پڕ لە بەختەوەری لەژێر سێبەری کۆمەڵێکی وا کە یەکسانیو ئاشتیخوازیو پەیوەندیی پاکو ڕاستەقینەی نێوان گشت دەوڵەتانی دروشم بێت . وولاتانی تازەسەربەخۆ بەردەوام کۆشی ئەوەیان بوو پەرە بە ئابووری یەکەیان بدەنو ژیانێکی ئاسوودە بۆ گەلەکانیان دابین بکەن .

قۆناغی پاش شەڕ ، پەرەسەندنێکی شۆڕشگێڕیی گرنگی بە خۆیەوە بینی . بۆ ئەوەی ئیتر لەژێر پەردەی ڕەشی چڵکنی کۆیلەو بەندیىو ڕکێفی ئیستعمار ئازادیان ببێت . . هەروەك لە کاکڵی شۆڕشەکانی ئازادیخوازانەی دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو ، بەتایبەتی لە ئەفریقیاو ئاسیادا ڕوویدا .

بێگومان ئەمەش بۆ ئەوەی نەخشەی ڕامیاریی جیهان دوای شەڕ نیگارکێش بکەنەوە . . سەرەڕای ئەودیوبوونی ڕکێفو زەبروزەنگی ئیمپراتۆریەتەکانی ژاپۆنو ئەڵمانو ئینگلیزو فەرەنگو بەرزبوونەوەی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا .

لە گەرمەی ساردە شەڕی نێوان دەوڵەتانی گەورەو بیرو هەستی دەوڵەتانی

# نو تەگەرەکانی

تازەپێگەیشتوو سەبارەت بە پاراستنی گەلەکەیان و دوورخستنەوەیان لە سەرشۆڕ بوون بۆ ئەملاو ئەولاو پەیڕەوگرتنی ڕێڕەوێکی ئەوتۆ بەرژەوەندی‌یە نیشتمانی‌یەکانیان بپارێزێ و ئازادبوونی رامیاری و ئابووریان بەتین بکات ، بیری دامەزراندنی «بێلایەن»و دانانی بەردە سیلەی پەیوەندی ئاشتیانەی نێوان ئەو دەوڵەتانە . لە گشت رووەکانی رامیاری و ئابووری و رۆشنبیری‌یەوە هاتە گۆڕێ . ئەوە بوو (کونگرەی باڵای باندۆنگ) لە ساڵی «١٩٥٥»ەوە ، ئەم هەموو هەوڵ و تەقەللایانەی رێك خست ، کە بیروڕا سەرەکیەکانی بزوتنەوەی بێلایەنی دانا ، بۆ مەبەستی رێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ و سەربەخۆیی نیشتمانی دەوڵەتانی‌یەوە . . وە یەکسانی نێوان دەوڵەتانی گەورەو بچووك . . هەروەها کشانەوە لە دەست‌دان لە کاروباری ناوخۆیی دەوڵەتانی ترەوەو چارەکردنی کێشەو مل‌ملانێ ی نێوانیان بە رێگای ئاشتیانەو پاکانەوە . سەرەرای گەشەپێدانی بەرژەوەندی هاوبەشی و هاوکاری‌ی دەوڵەتانەوە .

بە تێپەڕبوونی وەختەوە ، بزوتنەوەی بێلایەن بەرەوپێشەوە رۆیشت و لە گۆڕەپانی دەوڵەتانەوە ، چ لە میان کونگرەکانی یا لە ئاکامی تێکرا چالاکی‌یەکانیەوە ، کاریگەر بوو . بزوتنەوەکە هەر لە رۆژی بەستنی یەکەم کۆنگرەیەوە ، درکی بە گرنگی‌ی مەسەلەی ئابووری کردووە ، چونکە هۆی بنەرەتە کە تەگەرەی ئابووری دەوڵەتانی تازەپێگەیشتووی‌ی سەر بە بزوتنەوەکە چارەسەر دەکات . . بەتایبەتی چونکە تێکرا دەوڵەتانی تازەپێگەیشتو (نزیکەی ٧٠٪ی دانیشتوانانی دونیای تێدا نیشتەجێن) ، تەنیا ٣٠٪ی سەرجەمی دەرامەتی جیهانی دەست دەکەوێت .

وە ناوەندی‌ی دەرامەتی ساڵانەی تاکە کەسی لەم ولاتانەوە (٢٦٥) دۆلارە . . لە کاتێکا کە لە ولاتانی پێشکەوتوو لە ساڵانی حەفتاکاندا گەیشتبووە (٣٦٠) دۆلار . جگە لەوەی بەسەدەها ملیۆن هاولاتیانیان تووشی برسێتی بووینە . وە بە هەمان ژمارەش لەژێر پەردەی رەشی‌ی چلکنی نەخوێندەواری‌دا ناڵەو نق براون .

دیارترین ئەو تەنگوچەلەمە ئابووری‌یانەی کە دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو دووچاری هاتووە ، ئەمانەن :

١ – دابین‌کردنی سەربەخۆیی ئابووری کە بە سەربەخۆبوونی رامیاری‌یەوە بەستراوەتەوە . بەم چەمکە شەوە ، ئەم خاڵە دەبێتە گرنگترین ئامانجی بزوتنەوە کە لە پێناوی‌دا تێدەکۆشێ‌و دژی هێزی ئیمپریالیست ، کە تەقەللای سەپاندنی رکێفی خۆی دەکات بەسەر گەلان‌و سامانی دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو ، بەردەوام لە خەبات‌کردن دایە .

٢ – دابین‌کردنی پەرەپێدانی ئابووری‌و گەشەپێدانی ئابووری‌یەکانیان‌و بەرزکردنەوەی پلەی ژیانی گەلەکانیەوە .

٣ – بژارکردنەوەی رژێمی ئێستای ئابووری جیهان ، بەو رووەی یەکسانی لە نێوان گشت وولاتانی دونیادا دابین بکات .

بێگومان ئەمەش گۆڕانکاری زۆر بارو دۆخی بازرگانی دەوڵەتی‌و چارەسەرکردنی رژێمی دراوی دەوڵەتانی دەوێت .

کۆنگرەی بالای بێ‌لایەن بایەخێکی زۆری بە مەسەلەکانی ئابووری داوە . لە کۆنگرەی یەکەمی‌دا کە لە ساڵی ١٩٦١ لە بەلگراد بەسترا ، مافی گەلانی بریاردا لەوەی کە خۆیان دەست بەسەر خێرو خێرات‌و سامانی سروشتی وولاتەکانیان دا بگرن . کۆنگرە داوای لابردنی‌و نەهێشتنی نایەکسانی ئابووری لە نێوان دەوڵەتانی پێشکەوتوو و دەوڵەتانی دواکەوتووی کرد .

لە کۆنگرەی دووەمیشی‌دا ، کە لە ساڵی ١٩٦٤ لە قاهیرەدا بەسترا ، دوپاتی بریارەکانی پێشووی کردەوە . وە پاش بالای (لۆساکا) کە لە ساڵی ١٩٧٠ بەسترا ، بڵاوکراوەیەکی گرنگ دەرکرا کە ناوی «بڵاوکراوەی تایبەتی بە ئاشتی‌و ئازادی‌و پەرەپێدان‌و هاوکاری‌و دیموکراتیەت لە پەیوەندی‌یەکانی دەوڵەتانەوە» ی لێنرا .

وە مەسەلەکانی ئابووری ، لایەنێکی گرنگ‌و بنچی گرتەوە . وە بالای جەزایر کە لە ساڵی ١٩٧٣ دا بەسترا بە گۆڕانکاری‌ی لە خەباتی بزوتنەوەی بێ‌لایەن بەرەو دامەزراندنی پەیرەوێکی نوێ‌ی ئابووری دەوڵەتانەوە ، دەردەبردرێت . راگەیاندنی بڵاوکراوەی ئابووری بالای جەزایر ئارەزووی بزوتنەوەی بێ‌لایەنی سەبارەت بە چارەسەرکردنی تەگەرەکانی ئابووری جیهان‌و دانانی بەرنامەیەك بۆ هاوکاری‌ی ئابووری‌یەوە دەست نیشان کرد .

هەروەها ستراتیجیەتی ئێستای جیهان لەمەر پەرەپێدانی ئابووری‌و ئەو کۆسپانەی کە لە ئەنجامی بارودۆخی بازرگانی‌و دراوی دەوڵەتانەوە هاتۆنەتە کایەوە . . دیسانەوە مەسەلەی سەربەخۆیی بەروبووم‌و سامانی نیشتمانی‌و دەوری کۆمپانیاکانی فرەشووناسن لە رووتاندنەوەی وولاتانی تازە پێگەیشتوو . جا بە پێ‌ی ئەم بیروباوەرانەوە ، بەرنامەی ئیشی هاوکاری‌ی ئابووری پێشنیارکراو لە لایەن بالای جەزایرەوە ، ساز کرا ، بۆ ئەوەی بەرپرسیاری‌ی کۆمەڵی‌و پشت بە خۆ بەستن لە وەدەست‌هێنانی پەرەپێدان‌دا ، دابین بکرێت .

لە ئەنجامی جوڵانەوەو چاکی‌ی بێ‌ووچانی بزوتنەوەکە ، پاش بالای جەزایر ، لە ساڵی ١٩٧٤ کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان شەشەمین خولی بەروەختی بەست بۆ ئەوەی باس‌و لێکۆڵینەوە لەمەر مەسەلەی رژێمی نوێ‌ی ئابووری دەوڵەتانەوە بخاتە ئارا . وە مەبەست‌و بنچینە بنچی‌یەکانی بریار دا . وە دەوڵەتانی بێ‌لایەن ، لە ئاکامی بەستنی خولی حەوتەمی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئەیلوولی «١٩٧٥» لە کۆشش‌و دەست‌وبردی خۆیان زێدەکرد بۆ ئەوەی یاساو بەندو بنچینە بنەرەتیەکانی لە قسەو باس‌و ئاخاوتنەوە بخەنە ژێر جێ‌بەجی‌کردنی فعلی‌یەوە . وە بالای جەزایر بریاری دامەزراندنی سنووق پەرەپێدان‌و هاوکاری دا لە نێوان وولاتانی بزوتنەوە بە هاوکاری‌کردن لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکان‌دا .

گەر هاتوو کۆنگرەی پێنجەم کە لە «کۆلۆمبۆ» لە ساڵی ١٩٧٦ دا بەسترا ، تووشی چەند کۆسپ‌و تەگەرەیەك هاتبووبێ ، ئەوە بالای «هاڤانا» کە لە ساڵی ١٩٧٩ بەستراوە بایەخێکی زۆری دایە لایەنەکانی ئابووری‌و تەگەرەکانی‌یەوە .

وە هەرێمەکەشمان ، بە هۆی ئامادەبوونی سەرۆکی تێکۆشەر (صدام حسین) کە حازربوونی سیمای تایبەتی بە سەرکەوتنی ئامانجە پیرۆزەکانی بزوتنەوەکە داوە دەورێکی یەکجار مەزنی بینی‌و هۆێکی بەکارو کاریگەر بوو بۆ پتەوکردنی بیروباوەرەکانی‌و بەجێ‌گەیاندنی خواست‌و ویستەکان . نەك تەنیا بۆ دابین‌کردنی ئاشتی جیهانی‌و بەس ، بەڵکو بۆ دووپات کردنەوەی سەربەخۆیی دەوڵەتانی تازە پێگەیشتوو و بەهێزکردنی شوێن‌و پایەی دەوڵەتی‌یەوە ، دوور لە کارتێکردنی مەبەست‌و پیلانەکانی دەوڵەتانی گەورەیە .

ووتاری سەرۆکی بەرێز (صدام حسین) راستی‌ی نارێکی و کزی‌و ئابووری لە جیهاناو هۆیەکانی روون‌کردەوە . . پێشنیاری زانستیانەی بۆ چارەسەرکردنی کەموکووری رژێمی ئێستای ئابووری

دەوڵەتانی تێدا هاتووە . . وەپێشنیاری دامەزراندنی سنووقی جیهانی کرد بۆ یارمەتیدانی دەوڵەتانی تازە پێگەیشتوو .

سەرۆکی فەرمانده لە ووتارە مێژووەکەیدا تێگەیشتن‌و باوەڕی هەرێمەکەمان ، بە سەرۆکایەتی پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب سەبارەت بە «بزوتنەوەی بێ‌لایەن» ی روون کردەوە ، کە بە خەباتی گەلان بەستراوەتەوە لە پێناو پێشکەوتن‌و ئازادی‌و سەربەخۆیی‌یەوە .

سەرۆکی بەڕێز سووربوونی هەرێمی دوپات کردەوە . دەربارەی «مافی گەلان لە تەواوی دەست‌بەسەراگرتنی سامانی سروشتیان ، بە تایبەتی خۆماڵی کردنی سامانەکانیان‌و بەرگرکردنی دەرامەتیان بۆ بەرژەوەندی پەرەپێدانی سەربەخۆو هەمیشە بەرەو پێشەوەچوو بۆ گەلەکانیان . . وەراماڵینی رکێفی کۆمپانیا فرەشووناسەکان کە نوێنەرایەتی ئیستعماری نوێ دەکەن لە کارەکانی وێرانکردن‌و قڕکردنی سامان‌و دەرامەتی دەوڵەتانی تازە پێگەیشتوو . .» .

سەرۆکی بەڕێز پرۆژەی «دامەزراندنی سنووقی جیهان بۆ یارمەتدانی وولاتانی تازە پێگەیشتوو دژی پاشماوەی هەڵئاوسان بەو پێیەی کە دەوڵەتانی پیشەسازی بێ رەچاوکردنی سروشتی‌و چۆنیەتی رژێمی ئابووری‌و سیاسیان ، بە گوێرەی هەڵئاوسانی ساڵانەیان کە بۆ وولاتانی تازە پێگەیشتوو رەوانە دەکەن ، بەشداری لەم سنووقە بکەن . وەدەوڵەتانی تازە پێگەیشتوو ئەوانەی نەوت بەرهەم دەکەن بەرادەی ئەو زیادییەی کە لە نرخی نەوتدا پەیدادەبێ ، بەشداری تیا بکەن . .» خستە روو .

پتر بایەخدانی بزوتنەوەی بێ‌لایەن بەلایەنی ئابووری‌یەوە لەو راستی‌یەوە هاتووەو هەڵدەقووڵێ کە مەوداو بەینێکی فرە لە نێوان دەوڵەتانی پیشەسازی‌و دەوڵەتانی تازە پێگەیشتووەوە هەیە ، کە بووەتە سەرچاوەی نارەحەتی‌و شلەژاوی لە جیهانا ، بە تایبەتی بەنسبەت دەوڵەتانی تازە پێگەیشتووەوە .

ئاراستەکانی بزوتنەوەی بێ‌لایەن ، لە تێگەیشتنەکەیدا بۆ رژێمی نوێی ئابووری دەوڵەتان ، لەم چەند شتە بنجی‌یانەی خوارەوەوە دیاردەکرێن :

١ – بۆ مەبەستی باشکردنی مەرجەکانی بازرگانی بۆ وولاتانی تازە پێگەیشتوو و دابین‌کردنی نرخی یەکسانی‌یانە بۆ ناردنە دەرەوەکانیان‌و ئاسانکردنی گواستنەوە . . ئەبێ لە پەیوەندی‌یەکانی بازرگانێتی دەوڵەتانەوە رەچاو بکرێتەوە .

٢ – گۆڕانکاری بنجی بەسەر هەیکەلی بەرهەمی جیهان بکرێت لەسەر بنچینەی هەڵسەنگاندنی نوێی دەوڵەتانەوە ، بۆ ئیش‌وکار .

٣ – چارەسەرکردنی بارودۆخی رژێمی دراوی دەوڵەتانەوە . . وەکارکردن لە پێناو پاك کردنەوەو بژارکردنەوەی رژێمی ئێستای‌دا .

٤ – مسۆگەرکردنی گواستنەوەی کەرەسە لە پێناو پەرەپێداناندا بەشێوەیەکی بەردەوام‌و دوور لە رەگەزپەرستی ، وە بەو شێوەیەی کە کار لەسەربەخۆیی رامیاری‌و ئابووری دەوڵەتانی تازە پێگەیشتوو نەکات .

٥ – چارەکردنی تەگەرەکانی قەرز بۆ دەوڵەتانی تازە پێگەیشتوو چارەسەرکردنێکی تەواو .

٦ – رێ‌خۆشکردنی کارەکانی گواستنەوەی تەکنۆلۆژیاو هۆیەکانی زانستی‌ی پێشکەوتوو بە مەرجی ئاسانتر .

٧ – ماف بەو دەوڵەتە تازە پێگەیشتووانەی ناکەونە سەر کەنارو دەریاکانەوە بدرێت کە بتوانن بگەنە دەریاکانەوە ، وە بەگوێرەی بڕیارەکانی چوارەمین کۆنگرەی سەرەك دەوڵەتانی بێ‌لایەنی‌و بلاوکراوەی «داکار» لە شوباتی ساڵی «١٩٧٥»ەوە .

ئەو پێشکەوتنانەی بزوتنەوەی بێ‌لایەن وەدی هێناوە ، بەردە سیلەی ئەم بزوتنەوەیەی قایمتر کردووە . بێگومان ئەمەش بۆ خەباتی ولاتانی تازە پێگەیشتوو دەگەڕێتەوە کە بەردەم بۆ پتەوکردن‌و بەجێگەیاندنی بیروباوەڕەکانیەوە قەت لە هەوڵ‌و کۆششەوە نەکەوتوون . وە ئەو دەورە بەکارە کاریگەرەی هەرێمیشمان . لەم بارەیەوە . دەیبینێ . بەردەوام لە گۆڕە پانی دەوڵەتان بەشێوەیەکی گشتی‌و بزووتنەوەی بێ‌لایەن بەشێوەیەکی تایبەتی . لە بەهێزترو پتەوتر دایە . . بێگومان ئەمەش لە باوەڕە بەتینەکەی‌یەوە بە ئامانجەکانی ئەم بزوتنەوە دەوڵەتی‌یە مەزنە دایە . بەو پێیەی کە بڕبڕەی پشت‌و دینگەیێکی سەرەکی‌یە لە سیاسەتی دەوڵەتان‌و پاراستن‌و دابین‌کردنی ئاشتی جیهانی‌و پەرەپێدانی دەوڵەتانی جیهانی سێیەم .

وە لە باوەڕە رزگاریخوازو پێشکەوتوو و دیموکراتیانەی دا دژ بە دژی ئمپیریالیزم ، بە هەموو ڕوو و شێوەو جۆرەکانی‌یەوە .

جا لەبەر ئەمەوە ، وا چاوەڕوانی کۆنگرەی بالای بەغدا دەکرێ ، کە وا بڕیارە لە ساڵەدا لە بەغداوە ببەسترێ ، کە بە بڕیاری بەکارترو گرنگترەوە دەربچێت . . بێگومان بناغەی بنجیش بۆ پێشکەوتنی وولاتانی تازە پێگەیشتووش پێك دێنێت . . وە رەوڕەوەی پەرەپێدانی ئابووری بەرەوپێشەوە دەبات .

**رۆشنبیری نوێ لە رۆژنامەی (الثورە)**
**رۆژی ٩٨١/١٠/٣٠ وەری گێراوە**



دەستوورەکانی بنج و بناوانی ڕێزکردن لەمەڕ پێڕیست‌دانانی بەڵگەنامەوە پشت بەو خاڵانەی باسمان کردن دەبەستێت ، وە بەم جورە :

**یەکەم – بەڵگەنامە گشتی‌یەکان . جگە لەهەندێ حاڵەتی تایبەتیەوە نەبێت کە باسەکان بەتۆژینەوەو لێکۆڵینەوەی سەرپێ‌ی مەیدانیەوە بەستراوون . وەك باسە پیشەسازی‌و پزیشکی‌ی‌و گشتوکالی‌یەکانەوە . ئەگینا نابێ بەگوێرەی باسەوە ڕیزبکرێن .**

**دووەم** – بەڵگەنامە گشتی‌یەکان ، ئەبێ بەگوێرەی بەشەکانی ڕێکخستنی دەزگاکەوە ڕیزبکرێن . جا ئەگەر هاتوو دەزگاکە پەیرەوی مەرکەزی بەکاربهێنیت یان لامەرکەزی .

**سێیەم** – بەشیوەیەکی گشتیەوە ، بەڵگەنامە گشتی‌یەکان بەپێ‌ی ئەرك‌و کردەوئیش بەرهەمی کارو چالاکی‌یەوەو بەگوێرەی ئەرکەوە بەکارهێنراوە . وە نابێ ژمارەی بەشەکان زۆربێ‌و مەسەلەی ڕێکخستن – هێڵە گشتی‌یەکان – دۆسیێ عادی‌یەکان ، دۆسی‌ی نهێنی ، . . . هتاد ئاڵۆز بکات . وە ئەبێ پێداچوونەوەی کار ڕەچاو بکرێت ، واتا ئەرکەکان ئەوسا چالاکی‌و کردەکان .

هەروەها ئەبێ بایەخ بە دیاری‌کردنی دۆسی‌کانی سەرەکی‌ی‌و بنەڕەتی‌ی کاری دەزگاکە بدرێت‌و لەو دۆسی‌یانەو بەڵگەنامانەش‌دا جیابکرێنەوە کە باسی گشتی دەگرنە خۆوەو ڕەنگە لەهەر دەزگایەکی تریشەوە هەبێت .

دیسانەوە ئەبێت سەرباسەکان دیارو ڕوون بێن ، وەك سیاسەتی گشتی . کردەوەکان . بڕیارەکان . بەڕیرەوەکان‌و . . . هتاد . بە شێوەیەکی گشتی پەیرەوی ڕێزکردن تا بتواندرێ ئەبێ لەباری ناوخۆیی دەزگاکەوە بچێت .

## «ڕابەر بۆ کۆمەڵە ئەرشیڤی‌یەکان»

هەنگاوی دووەمی پاش تەواوبوونی ڕێزکردن‌و پێڕیست‌دانان . ئامادەکردنی لستەو ڕابەرو پسپوولەکانە .

لستە سەرەتاییەکان : بریتین لە ژمارەو چەندەکی بەڵگەنامەکان‌و نمرەی بەڵگەنامەو باس‌و مێژوو کاتبان لەسەر تۆمارکراون . وە هەمیشە سێ لستە دەکرێن : یەکەمیان تایبەتە بەو بەڵگەنامانەی ئەنێردرێن بۆ ئەرشیڤ‌ی نەتەوایەتی بۆ هەڵگرتنی هەمیشەیی . یان بۆ مەڵبەندی ناوەڕاست بۆ هەڵگرتنی بەڕووەخت .

لستەی دووەمیش بەندە بەو بەڵگەنامانەکەوا بۆ ماوەیەکی

دیاریکراو له ئەرشیڤی دەزگاکەدا هەڵدەگیرێنه .

سێیەمیش ، بۆ ئەو بەڵگەنامانەیە کە مەبەست فەوتاندنو دوورخستنەوەیان .

لستەکانی ئەو دۆسییانەی کە بۆ دەزگای نەتەوەیی دەنێردرێن ـ ئەبێ ئەم زانیارییانەی خوارەوەیان تیابێت :

**یەکەم** - ئەبێ پێشەکیەك بنووسرێتو کورتەباسی ئەو دەزگایەی بەڵگەنامەکانی لێوە هاتوون ببردرێت ، کورتە پێناساندنێکی کۆمەڵە ئەرشیڤیەکان لەمەر رێکخستنو پەیرەوی پێشووو مێژووی دەرکردنیەوە ، بەم جۆرەی خوارەوە بنووسرێت :

**أ** - مێژووی دامەزراندنی وەحدەی بەرێوەبردنو ئەرکەکانیەوە .

**ب** - پێشووەکانی بەرێوەبردن .

**ج** فەرمانی دامەزراندن یان ئەو لایەنەی کە بەگوێرەیەوە وەحدەکە یا دەزگایەکە دامەزرێنراوە .

**د** - شیکردنەوەیەك بۆ جۆرەها بەڵگەنامەکان ،وە بەپێی وەحدە دەزگا کۆنەکە یان لقە گەورەکانیەوە لەگەل روونکردنەوەی پەیوەندیی بە بەڵگەنامەکانی ترەوە لەناوخۆی ئەرشیڤی نەتەوەییەوە .

**دووەم** - ئەبێ یاسایێك هەبێت ماوەی هەڵگرتنو رێگاکانی ئامادەکردن دیار بکات .

**رابەر :**

رابەر بریتییە لە کارەکانی کۆبکردنەوەی دۆزینەوەکانی تایبەت بە کۆمەڵە ئەرشیڤیەکان وە بەڵگەنامەکانی هەر وەختە مێژووی دیاریکراو لەرابەردا کۆدەکرێنەوە .

لەهەندێ حاڵەتیشدا دۆزینەوەی کۆمەڵە بەڵگەنامەکانی باسی دیاریکراویش تیا کۆدەکرێتەوە . وە دەتواندرێ گشت رابەرەکان لەیەك رابەردا کۆبکرێنەوەو بۆ هەر کۆمەڵە بەڵگەنامەیەکی نوێش پاشکۆیەك دەربکرێت .

**پێرستی پسوولەکان :**

ئەم جۆرەش لە کۆمەڵە پسوولەی هاوپیوو پێك دێت . وە لە پێرستی بەڵگەنامەکان پێوەری (١٠ × ٥سم) بە چاك دەزانرێت .

پسوڵەکان بەپێی رێگەی رێزکردنی بەکارهێنرا لە دەزگاکەیدا یان بەرێگای (ئەبجەدییەوە) رێك دەخرێن .

پسوولەکان یان بەهۆی ئامێری پێرستی دەزگا یان بەهۆی پێرستی بینراو Indexs are ertically Swinging Loards or rotary Flaps) له خانەکاندا هەڵدەگیرێن .

## مەڵبەندی بەڵگەنامە ناوەندییەکان

هەندێ دەوڵەت ، بۆ ناردنی بەڵگەنامەو دۆسیێ داخراوەکانو کارەکانی بەرێوەبردن کەم بەکاردێن ، مەڵبەندی ناوەندییان دامەزراندووە . .

هۆی ئەمەش پاراستن بەڵگەنامەو یادکردنی شوێنە بۆ بەڵگەنامە بەکارەکان لە دیوانەکانی میریو دەرفەت باوبوون بۆ بەسەرکردنەوەو یەکلاکردنی پەراوەکان پێش ناردنیان بۆ هەڵگرتنی هەمیشەی لە ئەرشیڤی نەتەوەییدا وە ئەبێ مەڵبەندەکەش کارگێرێکی هەبێتو سەرپەرشتی وەرگرتنی دۆسێکانو وەلامدانەوەی پرسیار بکاتو بەکارەکانی یەکلاکردنی پەراوەکانەوە هەڵبسێن . دیسانەوە بۆ ئەوەی دۆسێکان بەشێوەیێکی نادروست لەسەریەکەوە کۆنەبنەوەو مەڵبەندەکە نەبێتە کۆگای بەڵگەنامەکانو پرۆگرامو پەیرەوی تایبەتیش هەبێت .

## بەرنامەکانی کار

**یەکەم** : وەرگرتنی دۆسێکانی گرنگ کە پڕە لە زانیاریی لەمەر دەزگاکەوە . واتە نابێ پەراوی بێنرخ وەك هی پروپاگاندەو کەتەلۆكو چاپکراوی تری بێکەڵك وەربگرێت . و وەك ئەم پەراوانە پێش ئەوەی لەدەزگاکاتەو . بۆ مەڵبەندی بەڵگەنامەکان بنێردرێن ـ ئەبێ لەلایەن موچەخۆرانی مەڵبەندو نوێنەرانی بەرێوەبردنی ئەرشیڤی نەتەوەییەوە فەحسو بژاربکرێنو بێکەڵکەکان بفەوتێندرێن .

کارەکانی فاردنی بەڵگەنامەکان لە نێوان دەزگای راپەرانەن - خاوەن دۆسێکان- و بەرێوەبردنی مەڵبەندەکە ئەبێ پەیرەودار بێتو لەپێشەوە بەرنامەی بۆ دابندرێت . وە نابێ ئەم کارە بەرێگایێکی سەرپێیەوە بکرێت ، بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی ئاڵۆزکردنو شێواندنی کار لە مەڵبەندەکەدا .

دیسانەوە بۆ رەوانەکردنی بەڵگەنامەکانیش ئەبێ بیر لە مەزامنی هەڵگرتنو ماوەی نێوان دەزگاو مەڵبەندو هۆکانی سەلامەتی بەڵگەنامەکان لەرێگاداو رادەی پێویستی گەرانەوە بۆ

دۆسێکان ، بکرێت . وە بۆ کەمکردنەوەی مەزامنی ناردن‌و هەڵگرتن بۆ دەزگاکە هەیە بێکەڵکەکان بفەوتێنێت ، وە ئەگەر ئەمە لەرووی هونەرییەوە گرانبوو پێویستە گشت بەڵگەنامەکان بۆ مەڵبەند بنێردرێن‌و لەوێوە بخرێنە ژێر تای هەڵسەنگاندن‌و بێکەڵکەکانیان بفەوتێندرێن .

**دووەم** - ئەبێ بەرێگایەکی پەیرەودارەوە دۆسێکان لەمەڵبەنددا دابندرێن‌و بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا بەئاسانی بۆیان بگەرێنەوە . واتە لەسەر موچەخۆرانی پێویستە لستەی رێك بۆ دۆسێکانەوە بکەن‌و کۆمارگەو نموونەی دەرکردنیان‌و گەراندنەوەیان بۆ شوێنەکانیانەوە هەبێت .

**سێیەم** — نابێ دۆسیێ بۆ وەختێکی درێژ لە مەڵبەندەکەدا بهێلدرێتەوە . وە بەپێی نەخشەیەکی دانراوی یاساداریەوە ،ئەبێ کار بۆ بژارکردنی بەردەوام بێت .

هەندێ بەڵگەنامە هەن بەردەوام ئەبێ بمێننەوە ، وە هەندێکی تریان بۆ ماوەیێکی بەروەختین‌و جارێکی تر تەماشایان دەکرێتەوە . بەشێکی تریشیان بێکەڵکن‌و ئەبێ دووربخرێنەوە وە ئەرشیفکاریش راستەوخۆ لە بەجێگەیاندنی لستەی هەڵگرتن‌و دوورخستنەوە بەرپرسیارە .

### «پاراستنی بەڵگەنامەکان لە مەڵبەنددا»

ئەرشێفیش بەرپرسیاریی بەرێوەبردنی مەڵبەندە لەرووی هونەرییەوە ، بەلأم خاوەنێتی بەڵگەنامەکان بۆ ئەو دەزگایە دەگەرێتەوە کە بەرهەم کردوون .

مەبەستیش لەمەوە ئەوەیە کە دەزگاکە بتوانێ بەکسانی‌و بێ چەندو چۆن بەڵگەنامەکانی بەکاربهێنێتەوە . ئەوەی گرنگە ئەوە کەوا هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ بەڵگەنامەدا ئەبێ لەژێر سەرپەرشتکردنی ئەرشیفکارەوە بێت‌و ، دەزگاکەش لێپرسینەوەی پاراستنی بەڵگەنامەکانیەوە لەرووی زانیارییەوە هەلبگرێت‌و ئەبێ ئەرشێفیش بەردەوام چاودێریی بەڵگەنامەکان بکات تا دەبێتە موڵکی ئەرشیفەوە .

## - کارەکانی هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامە- لە فەرەنسادا

هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامە بە گرانترین کۆسپ لەبەردەم ئەرشیفکارانەوە ، لەگشت وڵات‌و چەرخێکەوە دەردەبردرێت .

هەر لە رۆژانی شۆرشی فەرەنساوە ، ئەرشیڤیەکان هەوڵی ئەوەیان داوە چارەسەرێك بۆ ئەم تەگەرەیە بدۆزنەوە .

تاکو ئێستاش لێکۆڵینەوە بەپێی بارودۆخی دەوڵەتان‌و بەگوێری تاقیکردنەوەکانی کارکەرانی ئەم مەیدانەوە هەر بەردەوامە .

هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامە لەلای ئەرشیفکارە فەرەنساویەکانەوە شتێکی گران‌و ئاڵۆزبوو ، چونکە ئەو بەڵگەنامانەی شۆرش دەستی بەسەراگرت لە کۆتایی سەردەمی مەلەکیەتەوە لەکارخرابوون . وە بەسەر ئەو دەزگایانەدا زاڵبوو کە سەپەرشتییان دەکرد کە بەرامبەر بەکارەکانی میرییەوە لەرووی دارایی‌و دادگەری‌و مەدەنیەوە بێسوود بوون .

شۆرشگێران تا ئەو کاتەی بەرپرسیاران لە شۆرشدا فەرمانی پاراستنی بەڵگەنامەیان دەرکرد بەردەوام لەناویان دەبردو دەیان فەوتاند . وە لە ٢٥ی حوزەیران (یۆنیۆ)ی (١٩٧٤)ەوە ، بۆ پاراستن‌و بایەخپێدان‌و هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامەکان ، مەرسومێکی دەرکراو بەگوێرەیەوە لێژنەیەك پێك‌هێنرا . لێژنەکە چوار جۆرە بەڵگەنامەی پەسند کرد :

١ - پەراوە کەڵکدارەکان : وە بریتی بوون لەو بەڵگەنامانەی کە بۆ دامەزرانەنی مافەکانی دەولەت بۆ دەست بەسەراگرتنی مڵك‌و ماڵ پێویستبوون

٢ - بەڵگەنامە مێژوویەکان :

٣ - بەڵگەنامەکانی دەرەبەگ : وە بریتی بوون لە بەڵگەنامەکانی تایبەت بە مافەکانی دەرەبەگەکانەوە .

٤ - پەراوە هیچەکان‌و بەڵگەنامە وەختدارەکان .

لێژنەکە بریاری فەوتاندنی هەردوو بەشی سێیەم‌و چوارەمیدا . ئەو رێگایەی ئەرشێفیستە فەرەنساویەکان بەر لە شۆرشەوە بۆ هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامەوە دەیانگرتەبەر ، مەبەست هەڵبژردنی ئەو بەڵگەنامانەبوو کە نرخێکی مێژوویان هەیە . یاساکانی ئەم رێگایەش روون‌و ئاشکرا نەبوون‌و ، بەڵگەنامەکانیش لەرووی ئەرك‌و چالاکی‌و لێپرسینەوە بژارو فەحس نەدەکران ، بەڵکو بەپێی ریزکردنی باس‌و بابەتەوە بوون بێ ئەوەی پەنجە بۆ بنج‌و بناوان‌و پەیوەندکانیانەوە درێژبکرێت- واتە بەگوێرەی پەیرەوی کتێبخانەکان ریزدەکران- . وە لەبەر ئەوەی ئەم کارە کەوتبووە ژێر کارتێکردنی ئارەزووو هەوەستیی ئەندامانی لێژنەکانەوە ، حکومەتی فەرەنسا یاسایەکی توندوتیژی لەمەر فەوتاندنی بەڵگەنامە گشتییەکانەوە دەرکرد ئەم یاساسانەش دەستوورە

تایبەتیەکانی ئەو ئەرشیڤانەی کە لە سالی ١٩٢١ ەوە (برگەکانی (٥-٥٧) بەندی (٨)) دەکردابوو ، پاراستو زامینکرد ، سەرەرای دیارکردنی کارەکانی تایبەتی بە فەوتاندنی ئەو بەلگەنامانەی مەبەست فەوتاندنیانەو رێگاکانی بژارکردنی پەراوەکان لە ئەرشیڤداد ، ئەو لایەنەی هەلبژێردراوە بۆ فەوتاندنیانو رێگاکانی لەناوبردنو فرێدان . . هتاد .

یاساکان رێگاکانی چۆتیەتی هەلسەنگاندنو بژارکردنی بەلگەنامەکانی روونکردەوە .

مادەی (٥١) لەمەر دەرکردنی ئەم بەلگەنامانەبوو کە هەمیشە ئەبێ بمێننەوەو هەلبگیرێن .

مادەی (٥٥) یش کەمکردنەوەی چەندەکی ی بەلگەنامەکان یان دوورخستنەوەیان بەکارێکی ناوەختی دادەنێت .

وە بەگوێرەی مادەی (٥٢) یشەوە ، هەر بەلگەنامەیێك پێش سالی (١٨٣٠) یەوە پەیدا بووبێت ، ئەبێ هەتاهەتایە هەلبگرێت .

وە هەر بەلگەنامەیەکیش بە مافەکانو بەرژەوەندی دەزگا میریەکانەوە بەند بێ ، بەلگەنامەی مێژوویین .

مادەی (٥٣)ش ئەو بەلگەنامانەی کەوا رەنگە بفەوەتێنردرێن لەبەر ئەوەی کە زانیاریان لە چاپکراودا کورتکراونەتەوە لە ئەنجامی کۆتایی بێهاتنی ئەو ئەرکەی کە لەبێناوییەوە هاتۆتەکایەوە ، دەستنیشان دەکات . [١٨]

## لە ئەلمانیادا :

لە ئەلمانیادا ، ئەو دەزگا ئەرشیڤیانەی لەنووسینگە تۆمارگاکانەوە هاتوونەتەکایەوە ، بە ئەرکی هەلسەنگاندنی بەلگەنامەکانەوە هەلدەستن .

لەسەریەك کۆبوونەوەی بەلگەنامەکان بووە هۆی ئەوەی بەلگەنامە کۆنەکان دووربخرێنەوەو نوێیەکان جێگایان بگرێتەوە ، هەروەك پەیرەوی زۆربەی زۆری تیووری دەولەتانی جیهانەوە .

لەبەر ئەوەی لە نێوان بەلگەنامە کۆنەکاندا ، بەلگەنامەی گرنگو بەنرخ هەبوون ، وە لەوکاتەی بەرێوەبردنی ئەرشیف لە ئەلمانیادا بایەخدانێکی ئەوتۆی بەخۆوە بینیو وەك رابەری پێشکەوتنی ئەرکەکانی حکومەتەوە سەیری بەلگەنامەکانی دەکرد ئەوە بوو ئەو کۆمەلە ئەرشیڤیانەی لە دەزگاکانەوە کۆکرابوونەوە گشتان هەلگیرانو نرخی پاراستنیان زانرا .

لەسەرەتاوە ئەرشیفکارە ئەلمانەکان بریاری رێچکەی فەوتاندنی تۆمارگەکانی دۆسیێ هیچەکانیان دا چونکە کاری نەدەکردە سەر ناوەرۆکی زیندوویی بەلگەنامەکانو کۆمەلەی ئەرشیفیش سیاتە رەسەنیەکانی خۆی هەر هەلدەگرێتو لێی کەمنابێتەوە .

کارەکانی هەلبژاردنی بەلگەنامە (Selection) هەنگاوی یەکەمی گۆرینی تۆمارگایە بۆ کۆمەلی ئەرشیفی ی .

لەسال ١٩٠١ دا ، (میستر H.O.Meissner) سەرۆکی ئەرشیف پروسیار بۆ هەلسەنگاندنی بەلگەنامە پێنج دەستووری دانا ، ئەمانەن :

١ – رێزگرتنو بایەخدان بە بەلگەنامە کۆنەکان . بێگومان ئەمەش رێچکەیەکی چاکە چونکە بەلگەنامە کۆنەکان کەمنو بایەخیش لەم کەمیە دایە .

٢ – ئەو بەلگەنامانەی بەشێوەیەکی بەروەختی‌یەوە بۆ راپەراندنی کارێکەوە دانراونو بێسوود بوونیە ئەبێ دووربخرێنەوە .

٣ – ئەو بەلگەنامانەی پرن لەزانیاری لەمەر بینجو بناوانو پێشکەوتنی دزگاکان ئەبێ بەشێوەیێکی هەمیشەیی‌یەوە هەلبگیرێن .

٤ – دۆسێکانی تایبەت بە مولکداریو ، ئەوانەی مافەکانی دەولەت دەچەسپێنن ، ئەبێ هەتاهەتایە هەلبگیرێن .

٥ – ئەو دۆسیانەی تایبەتن بە مولکیەتی لایەنەکانی نامیرییەوە ، بەتایبەتی ئەوانەی بەندن بەشتی بنەرەتییەوە ، وەك : مولکداریتی ی راستەقینە ، سلفەو هەموو ئەو مافانەی لەمەر ناودارانو ئەوانەی هۆگری یاسا بوونیەو کاری‌تی‌کردوونو ئەو بەلگەنامانەی کردەی بەکارهێنراوی بەرێوەبردن لەمافەکاندا . . هتاد . روون دەکاتەوە ئەبێ هەلبگیرێنو بپارێزرێن .

پێنج رێچکەی تری تایبەت بە هەلگرتنیو پاراستنی بەلگەنامە میرییەکانیشەوە هەن ، ئەمانەن :

١ – ئەبێ بەلگەنامەکانی هەر دەزگایێکی بەرێوەبردن بەجیاوە هەلبگیرێن ، وەك : دۆستیی بەشو رێکخراوەکان ، ئاراستەکراو نیشتەجێبوونو کارگێرانی ئیشو کاروباری کەسەکان .

٢ – دۆسێکانی تایبەت بە کارە راپەرێندراوەکان ، ئەبێ بە رێگای پەیرەوی ئەو شوێنەی تیایدا بووەو لەئاکامی وەحدەکەوە پەرەی‌سەندووە هەلبگیردرێن ، نەك بەپێی

بەپێرەوی ئەو شوێنەی کە بۆی ناردراوەو هەڵی گرتووە .

وە نرخی دۆسێکانی گشتیی لە بەڕێوەبردنە یاریدەرەکان ـ ا ئەبێ لەرووی چالاکی بەشی یاریدەر کە لەوێوە هاتۆنەکایەوە ، هەڵبسەنگێندرێت .

٣ - بەڵگەنامەی بەڕێوەبردنە ناوەراستی یەکان : ئەم بەڵگەنامانەیە ئەگەر هاتوو پەیوەندیێکی زیندوویان بە بەڕێوەبردنەوە هەبوو و لەدەزگای بالآتریەوە وەرنەگیرابوو ، ئەوە ئەبێ هەڵبگیرێن .

٤ - دۆسێکانی تایبەت بە دەزگای نزمترەوە :

ئەم جۆرەیش گەر هاتوو پەیوەندیان بە بەڕێوەبردنی وەحدەکەوە هەبوو ، هەڵدەگیردرێن .

٥ - دۆسیکانی دەزگای قەزائی :

ئەمەیش ئەگەر هاتوو پەیوەندەی بە ئەرکە پوختەیی و بنەرەتییەکانی دەزگاکەوە هەبوو و پێشکەوتنی مافەکانی رەنگدایەوە ، ئەوە دیسان ئەبێ بپارێزرێن .

هەروەهایش بەرامبەر بەوانەی بەندن بە رووداوی مێژوویی و کارەکانی سیاسیی و نەریت و خورورەوشتی پێشووەوە . . هتاد .

پێش جەنگی یەکەمی جیهانیەوە ، دەسەلاتدارێتی ئەرشیف لە بروسیادا ، لێژنەیەکی بۆ دانانی دەستووری هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامەکانەوە دانا .

سەرەرای ئەوەی لێژنەکە لە ساڵی (١٩١٠)یەوە پێش ئەوەی کارەکانی بەجێ بگەیەنێ لابردرا ، بەلأم توانی چەندەها ئەنجامی گرنگ بەدەستەوە بدات .

ئەو راپۆرتەی کە (میسنر H.O.Meissner) نووسیبووی و ئەرشیف زانە ئەڵمانیەکان هەڵیان سەنگاندو وتووێژیان لەمەرەوە کرد ، گرنگێتی هەڵسەنگاندن راست و دروستی کاری ئەرشیفێتیەکان دوویات دەکاتەوە . وە لەسەر بیروڕای پێشووی هەڵسەنگاندنی سووربوو .

وە (مینیرت H.Meinert) ئەم رێچکانەی (میسنر)ی بە پەسند زانی و ئەو رێچکەیەی کە ئەبێ لە بنج و بناوانەوە لە بەڵگەنامە بکۆڵرێتەوەو شی بکاتەوە ، بە باشترینیانی دانا .

نێوبراو وا دەبینێ کەوا هەڵسەنگێنەر ئەبێ هەردەم گرنگیی سەرچاوەی لە مێشکدابێ و دانانی گشت وەحدەی بەڕێوەبردنیش بەرامبەر بە سەرجەمی قەبارەی ڕێکخستنی میرییەوە ، لەرووی چالاکیی و پەیوەندیی نێوان چالاکیەکان و پەیوەندییەکانی نێوان لایەنی سەرووی دەزگاکەو وەحداتی یاریدەر رەچاو بکات [١٩]

## لە ئینگلتەرەدا :

لە ئینگلتەرەشەوە ، هەرچەندە لەسەدەی حەڤدەهەمەوە بایەخ بە بەکارهێنانی بەڵگەنامە لەباس و لێکۆڵینەوەی مێژوویی دا درا ، بەلأم تا سەدەی نۆزدەهەمەوە ئەم بایەخ پێ دانە پڕ بە پێستی خۆی نەبوو . ئەوە بوو چەند لێژنەیێك ، بۆ تەماشاکردنەوەی رێکخستنی و هەڵگرتنی بەڵگەنامەو چۆنیەتی کەڵك لێ وەرگرتنی پێك هێنرا .

لێرەدا باسی ئەو کردە نوێیانە دەکەین کە لە ئینگلتەرەدا بۆ هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامەکانەوە کراوەو ، لە راپۆرتێکی کۆمەڵەی بەڵگەنامەناسە بریتانیەکاندا هاتووەو لەساڵی (١٩٤٣)یشەوە لە ئاکامی ئەو هەولأنەی کە بۆ رزگارکردنی بەڵگەنامەکان لە ترسناکیی جەنگی دووەمی جیهانی یەوە درا ، بلأوبوەتەوە .

وە ئەو بەندانەی لە راپۆرتی ساڵی (١٩٤٣) دا هاتوون ، لەو نامیلکەیەش کە لە لەندەندا لە دەزگای بەڵگەنامە گشتی یەکانی (Public Record Office) ەوە دەرکرا ، دووبارەکرانەوە .

وە لەم بوارانەی خوارەوە ، بڕیاری لەسەر رێچکەی هەڵگرتنی بەڵگەنامە گشتی یەکان بۆ مەبەستی بەڕێوەبردنی کارەکان و باسی زانستییەوە دا :

١ - بۆ روونکردنەوەی مێژووی دەزگاکە - خاوەنی بەڵگەنامەکان - .

٢ - بۆ وەلأمدانەوەی هەر داواو پرسیارێکی هونەریی لەمەر کارەکانی تایبەت بە بەڕێوەبردنی ئیشەوە .

٣ - بەجێگەیاندنی پێویستیی لێکۆڵەرەوەکان .

بەنیسبەت بەکارهێنان یەکەمەوە ئەبێ ناوەرۆکەکە لەمەر مێژووی دەزگاکەوە بەرفرەو بەڵگەدار بێت و ئەوەیش روون بکاتەوە کە دەزگاکە :

چۆن کارەکانی رادەپەڕاند ؟

ئیش و کاری چی بوو ؟

ئەو ئەنجامانەی وەدەستی هێناون چین ؟

هەروەها بەڵگەنامەکان ئەبێ بریتی بن لە کۆبوونەوەو بڕیارەکانی سیاسەتی گشتی دەزگاکە ، بەڵگەنامە ژمێریاریە گرنگەکان ، نامە تایبەتیەکانی گرنگترین چالاکیەکانی ، راپۆرتی مەسەلەکان (Case) و کردەوەکانی تایبەت بە ئیش و کار .

واتە ئەو بەڵگەنامانەی تایبەتن بە سیاسەتی کارکردن و بەجێگەیاندنی یان چۆنیەتی هەڵسوڕاندنی کاروبار لە رابردوو و

ئێستادا . بۆ ئەوەی گەر هاتوو موچەخۆری پێشوو نەما یان لابردرا . موچەخۆری نوێ بتوانێ بەرێکوپێکیەوە ئیشەکە بەرێوەببات .

بەڵام لە حاڵەتی بەکارهێنانی بەڵگەنامە بۆ باسی زانستی‌دا ، ئەبێ بەڵگەنامە سووددارەکانی هەڵبژێردرێن‌و لە پەراوە رۆتینییەکانی‌ترەوە بژار بکرێن‌و نموونەی کۆمەڵەی بەڵگەنامە گەورەکان وەربگێریت .

نابێ نموونەکان بە ئاڵۆزی‌و سەرپێیەوە وەربگیرێن ، بەڵکو . بۆ ئەوەی نموونەکان لەگەڵ کۆمەڵە ئەرشیڤی‌یەکانەوە گونجاوو رێك بێت . ئەبێ پرس بە شارەزایان‌و ماتماتیك‌ناسان بکرێت .

ئەم کارەش ئاسان نیەو پێویست بە ئاگالێبوونی‌و ناسین‌و زانینی ناوەرۆکی کۆمەڵەکە دەکات . وە ئەبێ مایکرۆفیلمیش بۆ وێنەگرتنەوەی هەندێ بەڵگەنامە بۆ نموونە یان بۆ برێتی ئەو بەڵگەنامانەی مەبەست دوورخستنەوەیانە ، بەکاربهێندرێت .

بەنیسبەت بەکارهێنانی دووەمیشەوە ، ئەوە ئەبێ ئەو بەڵگەنامانەی تایبەتن بە دەزگا گەورەکان‌و ئەوانەی بەڵگەنامە لە نووسینگاکانیانەوە هەڵناگیرێن ، بپارێزرێن . وە ئەبێ بەڵگەنامەکانیش نرخدار بن‌و پربن لە زانیاری مێژوویی‌یەوە .

بەرامبەر بە بەکارهێنانی سێیەمیشەوە ، ناملیکەکە (٧) دەستووری هەڵسەنگاندنی دیار دەکات کە ئەمانەن :

١ دوورخستنەوەی بەڵگەنامە کەڵکدارەکانییەکان .

٢ – دوورخستنەوەی بەڵگەنامە رۆتین‌دارەکان .

٣ – نەناردنی ئەو بەڵگەنامانەی سیمەتی بەرێوەبردنی خۆجی‌یان هەیە . وەك بەڵگەنامەکانی قوتابخانەو مۆزەخانەکان کە تەنیا لە دەزگاکە خۆی کەڵکیان لێ وەردەگیرێت .

٤ – لەو کانەی کە رەنگە کەڵك لە کۆمەڵی ئەرشیڤی ریزنەکراو وەربگیرێت‌و ناوەرۆکەکەی کارنەکاتە سەر هەندێ کەس یا زۆربەیان یان زانیاری‌ی گشتی لەمەدا جۆرەها باس بدات بەدەستەوە . ئەبێ پێوەری گشتی بەکاربهێندرێت .

٥ دووپات بوون لەوەی کە ئەو زانیارییانەی لەم بەڵگەنامانەدا هەن لە هیچ بەڵگەنامەی کۆمەڵانی‌ترەوە نین .

٦ – رەچاوکردنی بارودۆخی شوێن بۆ تیاهەڵگرتنی بەڵگەنامەکان . وە پێویست نیە وا بەر بیربکەوێ گەر هاتوو زانرا کە وێنەی تریان لە شوێنێکی ترەوە هەیە ، بە بەڵگەنامەی ناگرنگ دابندرێن .

٧ – پاراستن‌و هەڵگرتنی لستەکان یان دۆسی‌ی بەرادی

ئەو کۆمەڵە ئەرشیڤی‌یانەی کەوا رەنگە فەوتێندرا بن[٢٠] .

لە ساڵی (١٩٥٤)ەوە لێژنەیەك بۆ تەماشاکردنەوەی چۆنیەتی بەرێوەبردنی بەڵگەنامە میرییەکانەوە ، بەسەرۆکایەتی (سیر جیمس گریگ (Sir Jamas Grigg) پێکهێنرا . لێژنەکە راپۆرتێکی وای داناکە بە بنکەی گۆرین لە مێژووی بەرێوەبردنی بەڵگەنامەو ئەرشیف لە بەریتانیاو دەوڵەتانی ترەوە دەربردرا .

لە ئەنجامی ئەم راپۆرتەش‌دا ، یاسای ساڵی ١٩٥٤ کەتایبەت‌بوو بە بەڵگەنامە گشتی‌یەکانەوە دەرکرا . یاساکە بنج‌و بناوانی هەڵسەنگاندن . بژارکردنی بەڵگەنامە گشتی‌یەکانی روونکردەوە وە بەرپرسیارێتی‌ی پێشەیی (Professional Res Ponsibility) بەڵگەنامە گشتی‌یەکان لەمەر هەڵسەنگاندنەوە ، بۆ ئەوەی ئەو بەڵگەنامانەی نرخیان هەیە کە ئەبێ لەلایەن ئەرشیڤی‌ی نەتەوەیی‌یەوە فەحس بکرێن ، دووپات بکاتەوە ، بە دەزگای بەڵگەنامەی گشتی لە لەندەن‌دا سپێردرا . وە دەزگاکەش بەم پێ‌یەوە پەیرەوێکی تایبەتی بەڵگەنامەی داناکە لەگەڵ پێشنیارەکانی لێژنەی (گریگ Grigg) دابگونجی وای‌بینی کەوا بەکارهێنانی پەیرەوە کۆنەکان سەرنەکەوتنە چونکە دوو جۆر لە سوودی بەڵگەنامەکانەوە تێکەڵاو دەکات . سوودی مێژوویی – بەکارهێنانی بەڵگەنامە بۆ جۆرەها باس – و سوودی بەرێوەبردن (پێویست‌بوون بۆ هەڵگرتن‌و پاراستنی بەڵگەنامە بۆ هۆکانی قەزائی‌یەوە یان وەك سەرچاوە بۆ بەرێوەبردنی ئیش‌وکار) .

لێژنە وای بۆچوو کەوا بەرێگای فەحس – لە دوو پلەدا ، دەتوانێ لە تەگەرەی بژارکردنی بەڵگەنامەکانەوە رزگار بێت . قۆناخەکانیش ئەوەیە کە ئەبێ دوای تێپەربوونی پێنج ساڵ بەسەر داخستنی (پێوەدان)ی لە لایەن بەرێوەبەریی بەرپرسیارەوە فەحس بکرێن . وە تەنیا لەوانەی کە بۆ ئیش‌وکاری بەرێوەبردن کەڵکیان لێ‌وەردەگیرێت ، ئەوسا لستەیەك بەو بەڵگەنامانەوە سازبکرێت کە بۆ ئیش‌وکاری بەرێوەبردن یان قەزائی‌یەوە دەست‌نادەن‌و سەرلەنوێ بۆ پێنج ساڵی‌ترەوە هەلبگیردرێنەوە بۆ تەواو دووپات‌بوون کەوا بۆ کاری بەرێوەبردنەوە سوود ناگەیەنن .

لەسەر کارگێریش پێویستە ئاگای لە زانستی‌ی مێژووەوە هەبێت ، چونکە لەوانەیە هەندێ دۆسی‌ی داخراوە لە دەزگا میرییەکانەوە هەبیت . بەڵام بەکەڵکن‌و بۆنی مێژووی‌ی دەدەن .

راپۆرتەکە بایەخی تایبەت بە چۆنیەتی رێکخستنی هەڵگرتن‌و پاراستنی دۆسێکان دەدات . وە لەبەر ئەوەی کە دۆسێکان ،

ـەك پەراوە جیاجیاكان بژار بكرێن‌و بەس ، بەڵكو ئەبێ ـسەكانی دۆسێكانیش بە ووردوییەوە روونبكرێتەوەو موچەخۆرە كارگێڕەكانیش لەو پایە زانستی‌یە تواناداریە دا بن بتوانن كاروباری بەرێوەبردنی بەڵگەنامەكان بە چاكیەوە بەرنەسەر .

وە ئەو بەڵگەنامانەی لە قۆناخی بژاركردندا تەواو دەبن ، ئەبێ هەر لە دەزگاكەوە هەڵبگیرێن‌و بپارێزرێن .

دوای تێپەربوونی (٢٥) بیست‌و پێنج ساڵ بەسەر كار وەستاندن لە دۆسێكاندا ، دووبارە بەڵگەنامەكان لە رووی كەڵك لێوەرگرتنیان لە باسە زانستی‌یەكانەوە . بژاردەكرێنەوەو بەڵگەنامە بەنرخەكانیش بۆ هەڵگرتنی هەتا هەتایە بۆ دەزگای بەڵگەنامە گشتی‌یەكانەوە رەوان دەكرێن .

وە لەم پلەیە دووەمەدا ، ئەبێ نوێنەری دەزگای بەڵگەنامەی نەتەوەییش بەشداری بژاردن بكات بەو شێوەیەی كە شارەزایێكی تەواوی لەم بابەتەوە هەبەو دەتوانی پەیوەندی‌ی ئەو بەڵگەنامانەی كە دەنێردرێن لەگەڵ ئەو بەڵگەنامانەی لە دەزگاكەدا هەڵگیراون ، دیار بكات .

بۆ موچەخۆرانی ئەرشیڤەوە هەیە گەر لەم بارەیەوە ئاڵۆزی هاتە گۆڕێ ، پرس بە ئەكادیمی ناسان بكات .[21]

لەساڵانی ١٩٥٨ ، ١٩٦٢ ، ١٩٧١وە ، دەزگای بەڵگەنامە گشتی‌یەكان لە لەندەندا چەند رابەرێكی بۆ رێكخستنی كارەكانی بژاركردن‌و فەحسكردنەوەدا دەركرد .

**لەولاتە یەكگرتووەكاندا :**

دوای ئەوەی كۆتایمان بە باسی پەیرەوو یاسای هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامەكان لە سێ دەوڵەتی ئەوروپییەوە هێنا ، وا بە چاك دەزانین لەمەر تاقیكردنەوەكانی هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامە لە ولاتە یەكگرتووەكانیشەوە بدوێین ، چونكە پەیدابوونی ئەرشیڤ‌و كارەكانی لەم دەوڵەتەدا لەگەڵ دەوڵەتانی تری ئەوروپاییەوە جیاوازە .

شلینبرگ (Schellenberg) لە كتێبەكەیدا (ئەرشیڤی نوێ – بنچ‌و بناوان‌و رێگا هونەری‌یەكان)[22] و لە راپۆرتی كاری هەڵسەنگاندندا كە لە ئەرشیڤی نەتەوەیی‌یەوە دەركراون ، بنچ‌و بناوانی هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامەی داناوە . (شلینبرگ)یش بریاری مەسەلەی جیاكردنەوە لە بەكارهێنانی بەڵگەنامەوە لە پلەی یەكەمیدا (بەكارهێنانی كارگێڕییەوە)و پلەی ناوەنجی‌ی لە باسەكاندا . بەلاّم ئەوەشی زیادكرد كە ئەبێ پلەی ناوەنجی‌ی بیێت بە دوو بەشی سەربەخۆوە كە سوودی چەسپاندن (Evidentiol Values) وسوودی زانیاری‌ی (Informational Values)ن .

نێوبراو ئەوەی روونكردەوە كەوا ئەم دوو دەربرینە هیچ مانا نادەن بەدەستەوە گەر لە پیشەیی ئەرشیڤەوە رەچاو نەكرێن ، یان بەبێ تێگەیشتن مەبەست‌و سوودو كەڵكیانەوە . یان نرخی سەلماندن لەو بەڵگەنامانەی تایبەتن بە بنچ‌و بناوان‌و سەرچاوەی ئەو دەزگایەی كە بەرهەمی كردوون‌و ، پێشەكەوتن‌و پەرەسەندن دەزگاو ئەرك‌و چالاكیەكانیەوە .

ئەم بەڵگەنامانە . بۆ توێژینەوەی ئەو دەزگایەی بەرهەمی كردوون پێویستن . وەك ئەم بەڵگەنامانە ئەبێ هەڵبگیرێن چونكە پێیزەیی دامەزران‌و یاساكانی‌و پەراوی تایبەت بە سیاسەتی گشتی‌یەو راپۆرت‌و ئاراستەكراوەكانن . بەڵگەنامە كارەكە پتەوتر دەكات‌و سروشتی ئیشی دەزگاكە روون‌دەكاتەوە .

هەروەها بۆ دیاری‌كردنی نرخی بەڵگەنامەش ئەبێ پێكهاتن دەزگاو مێژووەكەی بزاندرێت .

بەلاّم سوودی زانیارییەوە ، زۆر جار ئەو لێكۆڵەرەوانەی بۆ مەبەستی زانینی مێژوو و ئەرك‌و چالاكیەكانی دەزگاكەوە . لە بەڵگەنامەكانی كارگێڕییە میرییەكانەوە دەگەرێن كەمن . وە زۆربەی زۆریان بەشوێن ئەو زانیاریانەی كارگێڕی‌ی‌و دەزگاكان لەمەر كەسەكان‌و رووداوو هوندی شوێن یان باسی تایبەتیەوە كۆیان كردۆتەوە دەگەرێن . وە ئەو زانیارییانەی لە بەڵگەنامەكانی دەزگا جیاجیاكانەوە بۆ وەدەست‌هێنانی مەبەستی ویستراو كۆدەكرێتەوە . لە كاتی هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامە ئەبێ وەك ئەم جۆرە بەڵگەنامانە نرخیان بدرێتی‌و لە خانەی بەڵگەنامە بەهادارەكانەوە دابندرێن .[23]

وە لەسەر ئەرشیڤ‌كاریشەوە پێویستە بیر لە بابەتەكانی باسی دوارۆژی‌دا بكاتەوەو بەو كەسانە بدات كە زاناو لێهاتوون‌و خاوەن رۆشنبیرێكی فراوان‌و دەتوانن داهاتوو لەمیان توانا زانستی‌یەكانیانەوە بخوێننەوە .

19 – OP.Cit,P.135
OP.Cit,P.137
2 1 – Cook,(M), Archives Administration,P P.Go-66
2 2- Schellenberg, (T.R) Modern Archives, P.P. 139-180
2 3L Cook, Archives Administration, P.P.67-69

گومان لەوەدا نی‌یە کە رادیۆم لە
نێوان کانزا کاندا سەیرترین و گرانترین
کانزایە ، تۆزێکی زۆرکەم لەو کانزایەدا بە
هەزارەها جونەیهو ودینار وەدەست
ناکەوێ . . رادیۆم زۆر کەمە و خەڵتی
هەوڵێکی یەکجار سەخت ئەدەن بۆ وەگیر
هێنانی .

ئەو ماددە سەرەتایی‌یەی کە رادیۆمی
لێ دەرئەهێنرێ لە هەرێمێکی زۆر کەم لە
جیهاندا بەدی ئەکرێ وەك کەنەدە
وبۆهیمیاو ئەمەش پێویست بە هەزارەها
کیلو لەو رشوکی‌یە ئەکات کە زاناکان
بتوانن چەند گرامێك لەو شتە وردکراوە
سپی‌یەی لێ دەر بهێنن کە رادیۆمی پێ
ئەوترێ . . .

سەیرترین سیفەتی ئەم کانزایە ئەوەیە
کە توانای چارە سەرکردنی هەندێ لەو
نەخۆشی‌یانەی هەیە کە پزیشکەکان
بێ‌یان نەکراوە چارەسەری کەنو بریاری
ئەوەیان داوە ئەم جۆرە نەخۆشی‌یانە
چارەسەر ناکرێن . .

بەلام بە هۆی ئەم کانزایەوە توانرا
چارەسەری نەخۆشی‌یەکانی پێست وەك
شێرپەنجەو نەخۆشی‌یەکانی تر بە رێگەی
تیشکی رادیۆمەوە بکرێ . . بۆیە هیچ
جێگەی سەر سوورمان نی‌یە کە
خەستەخانەکان بۆ وەرگرتن و کرینی ئەم
کانزایە کاریگەرە پارەیەکی یەکجار زۆر
سەرف بکەن . .

چیرۆکی دۆزینەوەی رادیۆم بە
چیرۆکی مەدام کۆری ئەبەسترێت ، یاخود
ئەتوانین بڵێن چیرۆکی رادیۆم چیرۆکی مەدام
کۆری خۆیەتی . . مەدام کۆری بەرزترین
وگەورەترین ئافرەتە کە لە مەیانی زانیاری
سرۆشتا ئیشی کردووە ، لە وڵاتی پۆڵەندە لە
دایك بووەو لە فەرەنسە ژیاوە وزۆربەی
رۆژەکانی هەر لەوێ بەسەر بردووە ومێردی
بە (بییر کۆری) کە یەکێك لە زانایە هەرە
بەناو بانگەکانی فەرەنسا بووە کردووە ،
(بییر کۆری) کە هاوبەشی‌یەکی زۆری لە
مەسەلەی دۆزینەوەی رادیۆمی
کردووە . . سەرەرای ئەوەی کە زۆر بە
ناوبانگ بووە بەلام بە درێژایی ژیانی
هەستی بەو شتەی نەئەکرد . . زانیاری لای

[redacted]

مەدام کۆری شتێکی بڵندو بەنرخ بوو. ژیانەکەی بریتی‌یە لە شتێکی سادەو ئاسان، تەنیا چەند رۆژە خۆشی‌یەك نەبێ کە بۆمان وەدەر ئەکەوێ.. جگە لەمەش زۆر بە دڵسۆزی‌یەوە خزمەتی مێردەکەی‌و کچەکەی ئەکرد وەتا لە ژیاندا بوو هەر خەریکی ئیش وکار بوو..

مەدام کۆری لە شاری وارشۆ لە رۆژی حەوتی مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٨٦٧ دا هاتووەتە دونیاوەو. باوکی لە یەکێك لە قوتابخانەکانی شاری وارشۆ مامۆستای زانیاری‌و وەرزش‌بوو، (ماریا سکلودۆفسکا)ی کچی – ئەمە ناوەکەیەتی بە زمانی پۆڵەندی – یەکەم وانەی زانیاریی لە باوکی فێر بوو.

سەرەتای ژیانی ماریا پڕ لە خۆشی‌و کامەرانی بوو. چۆنکە بچووکترین منداڵ بوو بۆ خێزانەکەی و لەلای هەمووان خۆشەویست بوو بەڵام نەگبەتی و کارەساتی ژیان وردە وردە بۆی پەیدا بووەوە.. کە تەمەنی گەیشتە نۆ ساڵ خوشکە گەورەکەی بە نەخۆشی تیفۆس کۆچی دوایی‌کردو پاش یەك ساڵیش دایکی مرد، ئەو دایکەی کە چەند ساڵێك بە دەستی نەخۆشی‌یەوە ئەناڵاند، مردنی دایکی کارێکی یەکجار توندی بەسەر ماریا دا کرد چۆنکە ماریا زیاتر لە هەموو کەسێك دایکی خۆش ئەویست‌و ئەیپەرست.

**بەرەو شاری پاریس:**

باوکی ماریا پیاوێکی دەوڵەمەند نەبوو.. بۆیە ماریا ناچار بوو واز لە خوێندن بهێنێ، نەك هەر خۆی بەڵکو هەتا خوشکەکانیشی مەکتەبیان بەجێ هێشت. ماریا دەستی بە ئیش‌کردن کرد وەك براکەی‌و باقی خوشکەکانی بۆ ئەوەی



بتوانن ژیانی رۆژانەی خۆیان بەسەر ببەن ، ماریا دەرسی بە منالی خێزانە دەولەمەندەکانی ئەوتەوە . . ئەم ئیشەش کارێکی ئاسان و دلخۆشکەر نەبوو چونکە قوتابییەکان بە زۆری تەمەڵن و هیچ ناخوێننو ئەرکەکانی سەرشانیان بەجێ ناهێننو باوکەکانیشیان ئەو پیاوە بە سەخاوەتە نین . . جگە لەمەش کارێکی وەهاش دەستکەوتێکی باش وەدەست ناهێنێ . سەرەرای ئەم هەموو گیروگرفتانە ئەندامانی خێزانی سکلودوفسکا لە سەر ئیشەکەیان بەردەوام بوون . . ئەمە تەنیا رێگەیان بۆ چاکردنی ژیانیان بوو . . (برۆنیا) کە خوشکە گەورەی (ماریا) بوو نیازی ئەوەی هەبوو بۆ خوێندن بۆ پاریس سەفەر بکات . بچێتە ئەوێ بۆ ئەوەی لە زانیاری پزیشکیدا بخوێنێ و پاشان بۆ پۆلەندە بگەرێتەوە .

(ماریا)ش هەمان ئاوات و خواستی هەبوو . . زۆر حەزی لەوە ئەکرد بچێتە پاریس وشت فێربێ و کە بگەرێتەوە سوود وکەلك بە منالانی ولاتەکەی بگەیینێو خوێندنی زانیاری سروشت وکیمیاوی بۆ خۆی هەلبژارد بوو .

ماریا بریاری ئەوەیدا کە خوشکەکەی لە پێشان بچێتە پاریس ئنجا خۆی نەك بۆ چەند سالێکی دوور درێژ پارە کۆبکەنەوەو چاوەروانی بکەن . . کە برۆنیا سەفەر بکات ئەم ئەتوانێ ئیش بکات و پارەی بۆ بنێرێ . ئەم فیکرەیە سەخاوەتێکی یەکجار گەورەیە چونکە مانای چاوەروان کردنێکی دوور و درێژ ئەگەیێنێ پێش ئەوەی چاوی بە پاریس بکەوێت .

لە سالی ١٨٩١ دا ئەو رۆژە هاتەکایەوە کە ماریا توانی بە سەفەرێکی دوورو درێژ بە رێگەی ئەورۆپا وە بگاتە پاریس و لەسەر یەکێك لە کورسییەکانی زانکۆی سۆربۆن وەك قوتابییەك دانیشێت . . هەر کە ماریا گەیشتە پاریس دەستی بە جێبەجێکردنی پەیرەوێکی سەختو ژیانێکی ئاسایی لە خوێندندا کردەوە . . بریاری دا دو وانە پێکەوە پەیرەو بکات بۆ ئەوەی دو دەرەجەی ماجێستێر پێکەوە وەربگرێ یەکێکیان دەربارەی سروشت و ئەوەی تریش دەربارەی ماتماتیك .

لە نێوان ئەو زانایانەی کە لە پاریس ماریا لەگەلیانا دەستی بەئیش‌کردن کرد ، زانایەك بە ناوی (بییرکۆری) بوو . . (بییر کۆری) لە پاریس لە سالی ١٨٥٩دا لەدایك بوو . . باوکی پزیشك بوو و هەر لە منالییەوە حەزی لە زانیاری بوو و کە تەمەنی گەیشتە شانزەسالان پلەی بەکەلۆریۆسی لە زانیاری وەرگرت و لە تەمەنی هەژدە سالیدا پلەی ماجستێری وەرگرت و کە چاوی بە ماریا کەوت لە تەمەنی سیوپێنج سالیدا بوو . . (بییر کۆری) لە مەیانی دۆزینەوەی سروشتیو موگناتیز بەناوبانگییەکی یەکجار گەورەی پەیدا کردبوو .

**بوو بە مەدام کۆری**

(بییر کۆری) و ماریا سکلودوفسکا پێکەوە زانیارییان لە هەموو ستێکیدا زیاتر خۆش ئەویست . ئەمەش بوو بەهۆی بە هێز بوونی هاورجێیەتی و پێوەندی لەنێویاندا ، ئیشێکی زۆریان پێکەوە کردو پاش سالێك حەزیان لەیەکتری کرد . . لە سالی ١٨٩٥ دا ماریا سکلودوفسکا بوو بە مەدام کۆری .

شووکردنی ماریا بە (بییر کۆری) نەك تەنیا ببوو و بە پەیدا کردنی بەختیاریو کامەرانییەك بوو بۆیان بەلکو هاوبەشیەکی یەکجار بەرزو بە نرخی زانیارییانە بوو . . (بییرو ماری) هەتا ماوەیەك گرنگییەکی زۆریان بە لیکۆلینەوەکانی زانیارێکی فەرەنساوی بە ناوی (باکیرێل) ئەدا ، ئەو زانایە کە مەعدەنی یۆرانیۆمی دۆزیبووەوە و ئەوەی بۆ روون ببووەوە کە جۆرە تیشکێکی لێ دەرئەکەوێ لە تیشکی سینی ئەچێ و کار لە وێنە فوتۆگرافیەکان ئەکات هەرچەندیش بە کاغەزی رەشیش بپێچرێنەوە . . بییر وژنەکەی هەتا ماوەیەك هەر خەریکی ئەوە بوون بیربکەنەوە بۆ ئەوەی ئەوەیان بۆ ساغ ببێتەوە ئایا تیشکی یۆرانیۆم چی دروست دەکات و چی لێ دەرئەچێ ؟ یاخود ئەو شتەی کە پەیدا ئەبێ هێزی چەندە ؟ ئەم پرسیارانە و هەندی پرسیاری تریش بییر و ماریای تووشی گیروگرفتێکی زۆر کرد ، بۆیە بریاریاندا ئەم تیشکە باشترین بابەتە بۆ ئەوەی ببێتە نامەکەی مەدام کۆری بۆ وەرگرتنی پلەی پسپۆری . .

مەدام کۆری - لە نەخۆشترین بارودۆخدا دەستی دایە لیکۆلینەوەکانیو ژووریکی کۆنیش لە ژوورەکانی زانکۆوەکەیدا کرد بە کارخانەیەك بۆ تاقیکردنەوەکانی — شوێنەکە سەرەرای ئەوەی کە زۆر تەسكو بچووك بوو بێ داموو دەزگاش بوو — بۆیە مەدام کۆری بریاریدا تا ئەوەندەی هەول و توانای هەیە کەمتەرخەمی لە تاقیکردنەوەکانی نەکات . . ئەوەندەی پێ نەچوو ئەوەی بۆ ساغ بووەوە کە تیشکی رادیۆم زۆر سەیرترە لەوەی بیری لێ ئەکردەوە .

مەدام کۆری بیری لەوە ئەکردەوە ئەو ماددە کیمیاوییانە بدۆزێتەوە کە تیشکی وەك ئەم تیشکە وەدەر ئەخەن ، بۆیە

دەبێتی بە تاقیکردنەوەی مادە کیمیاوی‌یە دیاری‌یەکان هەر یەکە بە جیاکرد و زۆر جاریش دوبارە یان ئەکردەوە ، لە کاتی دوبارەکردنەوەدا ئەوەی بۆ دەرکەوت کە ماددەیەك هەیە لەناو ئەرز دایە و بە ناوی (بتشبلانا) ناسراوە تیشکێکی وەهای لێ‌دەر ئەچێت لە گشت تیشکەکانی‌تر بە هێزترە .

کە پەیداشیانکرد ، واتە کە کارخانەکەیان وەدەست کەوت ، ئەبێ هەزار کیلو لەو ماددەیە بیکڕن‌و دەست بە تاقیکردنەوەی هەزار کیلو لەو ماددەیە بکڕن و دەست بە تاقیکردنەوەی بکەن . . ئەم ماددەیە تەنیا لە ولاتی نەمسادا هەبوو .

چوار سالی پڕ لە کارکردنێکی سەخت تێپەڕی پێش ئەوەی رادیۆم بە شێوەیەکی پاك‌و خاوێن لە بتشبلاندا بدۆزرێتەوە . پاشان بۆیان روون بووەوە کە رادیۆم لەوە زیاترە کە بیریان لێ ئەکردەوەو سەیرتربشە . . تیشکی رادیۆم بە دوملیۆن جار لە تیشکی یورانیۆم بەهێزترەو هەتا لە کاتی بەرەبەیانداش ئەوەیان بینی کە رادیۆم تیشکێکی وەها ئەدات مرۆڤ ئەتوانێ لەبەر رووناکی‌یەکەی‌دا شت بخوێنێ . . رادیۆم تەنیا تیشکی نی‌یە بەلکو گەرمایی‌ش ئەبەخشێ و ئەو گەرمایی‌یەی کە میقداری رادیۆم لە ماوەی سەعاتێکدا پەیدای ئەکات توانای توانەوەی میقدارێکی سەهۆڵ هەیە کە قورسایی‌یەکەی بە قەد قورسایی میقداری رادیۆمەکەیە ، سەرەرای ئەوەش هەرچی شتێك لەو تیشکە نزیك بێتەوە وای لێ‌دێت تیشك پەیدا بکات ، واتە تیشکدار ئەبێ ، ئەم دو زانایە ئەوەیان بینی کە پێستی لەشیاز تیشکی رادیۆم کاری لێ‌کردووە ، چونکە بۆ یەکەم جار سوور ئەبێتەوە وای لێ دێت وەك بەر ئاگر کەوتبێ و تەنیا رێگەش بۆ پاراستنی پێستی مرۆڤ لەم تیشکە ئەوەیە کە رادیۆم لە قوتوی قورقوشم‌دا بپارێزرێ .

مەدام کۆری بریاری ئەوەی‌دا ئەم رەگەزە تازەیە بە ناوی (رادیۆم) لە قەڵەم بدات چونکە تیشکەکەی لە مەعدەنەکانی‌تر زۆر بە زیاترو بەهێز ترە . .

ئەو چرکەیە ، واتە ئەو ساتە خۆشترین بەختەوەری و کامەرانی بوو بۆ بنەماڵەی کۆذی ، ئەو کاتەی کە مەدام کۆری وەك دۆزەرێکی رادیۆم وەدەر کەوت‌و پلەی دوکتۆرای پێ وەربگرێ . . مەدام کۆری زۆر بە ئاسایی‌و دڵفراوانی دەربارەی لێکۆڵینەوەکانی بۆ گوێگران قسەی کرد ، هەرچەندیش ئەو شتەی دۆزرابووە رووداوێکی زۆر گەورە بوو بەلام چەپڵەرێزانی تێدا نەبوو و هەتاکە شتەکەشی بلاو کردەوە کەس ورتەی لە دەما دەر نەهات . . ماموستاکان پرسیاری زۆریان لێ‌کرد و پاش ئەوەی کە پرسیارەکان تەواو بوون سەرۆکەکەیان بەرێز و ئیحترامەوە هەستایە پێوە و بەم جۆرە مەدام کۆری پلەی دوکتورای لە زانیاری سرۆشت لە زانکۆی پاریس وەرگرت .

## رادیۆم لە پاش دۆزینەوە دا

هەنگاوی دووەم ئەوە بوو کە چۆن بتوانن رادیۆم بە پاك وخاوێنی لە (بتشبلاند) پەیدا بکرێ و بۆیە ئەم دو زانایە ئەبوا بیر لە پەیدا کردنی کارخانەیەکی گەورە بکەن بۆ ئەوەی (بتشبلاند)ی تێدا تاقیبکەنەوەو (بیرکۆری) و دو زانای بە ناوبانگی‌تر خۆیان خەریکی ئەوە کردبوون کە بزانن ئایا رادیۆم چ کارێکی لە پێستی مرۆڤ ئەکا . بیێر کۆری گوێ نەئەدایە خەتەری رادیۆم‌و باڵی خۆیی کردە مەیانێك بۆ ئەو مەبەستە . . پاشان زاناکان ئەوەیان بۆ ساغ بووەوە کە رادیۆم توانای چارەسەرکردنی هەندێ نەخۆشی پێستی هەیەو تەنانەت شێرپەنجە ش دوور نی‌یە پێ چارەسەر بکرێ . . بەم جۆرە ئەم رەگەزە تازەیەی کە مەدام کۆری بە هۆی یارمەتی دانی مێردەکەیەوە دۆزیەوە بۆ مرۆڤایەتی باشترین نیعمەت بوو .

بیێرو ماری کۆری ذۆر زوو و بە کوت‌و پڕی بە ناوبانگی یان وەرگرت ، واتە بەناوبانگ بوونەوە ، کومەڵەکە لە لەندەن پاداشتی دافی یان پێ بەخشی و زانکو زانیاری سویدی‌ش پاداشتی نۆبلی لە زانیاری پێ‌یان دا بە مەرجێك لەگەڵ «هنری باکیریل» دابەشی بکەنەوە .

بەلام لەو کاتەدا کە مەدام کۆری لە لوتکەی سەرکەوتن‌دا بوو مێردەکەی لە یەکێك لە شەقامەکانی پاریس‌دا بە هۆی عەرەبانەیەکەوە کۆچی دوایی کرد . . ئەم کارەساتە سەختە لە سالی ١٩٠٦ دا رووی‌دا و مەدام کۆری بە هیچ شێوەیەك بروای بەوە نەئەکرد کە بیێر کۆری بەم ئاسانی‌یە لە ناو بچێت‌و بمرێ . مەدام کۆری هەستی بەوە ئەکرد کە پێ‌ناکرێ لەم ژیانە سەختەدا بەبێ مێردەکەی بتوانێ بژی‌و تەنانەت دۆزینەوەکەیشی دەربارەی رادیۆم وای لێ هاتەوە وەك شتێکی بێ ماناو قیمەت بێتە پێش چاوی ، کارەساتەکەی وەهای لێ کردبوو بیر لە هیچ شتێك نەکاتەوە جگە لە کارەساتەکە خۆی . . بەلام وردە وردە کارخانەکە دەستی بە راکیشانی کردو بە تایبەتی پاش ئەوەی کە زانی کە مێردەکەی حەزی زۆری لە بەردەوامی کارخانەکە بوو ، جگە لەمەش ئەوە هاتە بەر چاوی کە ئەم کارخانەیە تەنیا شتە توانای ئەوەی هەبێ کارەساتە سەختەکەی لەبیر بباتەوە .

### له پەرستگای دوا رۆژ دا

مەدام کۆری و مێردەکەی هەتا چەند ساڵێك خەونیان بەوە ئەبینی رۆژێ لە رۆژان کارخانەیەکی رێك‌و پیك و تەواو و باشیان دەست کەوێت بۆ ئەوەی بتوانن بە شێوەیەکی وردو زانایانە تاقیکردنەوەکانیان تێدا جێ‌بەجێ بکەنەوەو هەتا کە زاناکە داوای ئەوەی کرد کە رادیۆم پێویستە بۆ هەموو خەڵق بێ ، لەو کاتەدا نە زانکۆی پاریس شوێنیکی باشی بۆ ئەو کارخانەیە ئامادە کردو نە میریش پارەو پوولیکی باشی بە مەدام کۆری‌ی دا بۆ ئەوەی فێرگەیەکی بۆ رادیۆم بکاتەوە ، بەڵام ئەو شتە لە پاش، تێپەر بوونی هەشت ساڵ بەسەر مردنی بیێر کۆری دا و لەو کاتەی کە مەدام کۆری هیچی بۆ نەما بووەوە زانکۆی پاریس بەجێ بهێڵێ ئنجا ئەو مەسەلەیە جێ‌بەجێ کرا ، واتە پاش مردنی بیێر کۆری بە هەشت ساڵ دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمە لە فەرەنسا پارەیان پێشکەش بە مەدام کۆری کرد .

بنایەکی سپی دروست کراو چەند کارخانەیەکی گەورەو فراوان بە پەنجەرەی گەورە گەورە بنا کرایەوە و ئەو دام و دەزگایانەی کە مەدام کوری ویستی بەگشتی ئامادە کران . . مەدام کۆری بۆ خۆی نەخشەی کارخانەی رادیۆم و فێرگاکەی کێشاو ئەو فێرگەیە بە ناوی (پەرستگای دوا رۆژ) ناو نرایەوە . .

بەڵام لە پاش تێپەر بوونی یەك مانگ بەسەر دروست‌و تەواو بوونی ئەو فێرگەیە شەری یەکەمی جیهانی دەستی پێ کردو ماموستاو زاناو کرێکارانی کارخانەکە بوون بە عەسکەر .

بەم جۆرەش مەدام کۆری بە تەنیا مایەوە – وای لێ‌هات نەزانێ خێزانەکەی چیان بەسەر هاتووە چۆنکە عەسکەری ئەڵمانیا پۆڵەندای داگیر کردبوو – بۆیە بریاری دا تاقیکردن و لیکۆڵینەوەکانی رادیۆم دوا بخات‌و بریاری ئەوەشی دا کە خزمەتێکی چاك دژ بە ئەڵمانیا بگەیێنێ بە رێگەی بەکار هێنانی تیشکی سینی بۆ چارەسەر کردنی زامدارەکانی شەر . . بۆیە دەسەڵاتداران و ژنە دەوڵەمەندەکانی بۆ بیتاك کۆکردنەوە هان‌ئەدا هەتا لە دوایی دا توانی بیست ئوتۆمبیل رێکبخات و بۆ خۆشی بوو بە رابەر و لەم شوێن بۆ ئەو شوێن لە مەیدنەکانی شەردا ئەگەران ، ئەم ئوتۆمبیلانە بە گشتی دام و دەزگای تیشکی سینی‌یان هەڵگرتبوو ، سەربازەکان ئوتۆمبیلەکەی مەدام کۆری‌یان بە – کۆری‌یە بچکۆلەکان‌یان ناو ئەبرد . . مەدام کۆری توانی دو سەد خەستەخانە بۆ ئەم مەبەستە بکاتەوە و زیاتر لە میلیۆنێکی برینداری تێدا چارەسەر کرا ، ئەمەش بێگومان پێش کوتایی بوونی شەرە جیهانی‌یەکە بوو .

هەر کە شەر کوتایی پێ هات مەدام کۆری بۆ فێرگەی رادیۆم ە کە گەرایەوەو سەر لە نوێ دەستی بەئیش کردەوەو رادیۆمیش وەك زانیاری‌یەکی سەربەخۆیی لێ هاتەوە . . ئەوەی لە سەر مەدام کۆری پێویست بوو لەم کاتەدا ئەبوایا لیکۆڵینەوەیەکی یەکجار زۆر فراوان بکات . بۆ ئەم مەبەستە کۆمەڵێکی زۆر لە زاناکانی ئەو سەردەمەی لە دەوری خۆی کۆکردەوەو فێری زانیاری‌یە تازەکەیانی کرد . فێرگەکە وای لێ هات لە کاتێك بۆ کاتێکی‌تر ئەوە بلاو بکاتەوە کە دۆزینەوەیەکی تازە لە مەیانی رادیۆم دا وەگیر هێناوە . .

مەدام کۆری حەزی لە بەناوبانگی‌یی نەئەکردو پێ خۆش نەبوو لەبەردەمی جەماوەردا دەرکەوێ و چەپڵەی بۆ لێ بدرێ و حەزیشی لەوە نەبوو ئاهەنگێکی تایبەتی‌ی بۆی ئامادە بکرێ . . ئەوەی راستی بێ مەدام کۆری تەنیا لەگەڵ دوکچەکەی‌و کارگاکەی نەبێ کە فێرگەی رادیۆمی تێدا بوو هەستی بە خۆشی‌و کامەرانی نەئەکرد ، بەڵام بەناوبانگی‌یەکەی کەڵك‌و سوودێکی یەکجار گەورەی لە مەیانی لیکۆڵینەوەی رادیۆم‌دا هەبوو . . ئافرەتان زۆر خۆش‌یان ئەویست هەتا وای لێ‌هات ببێتە هۆی هەڵسانی ئافرەتانی ئەمریکا بە کۆکردنەوەی پارەیەکی ئەوتۆ و پێشکەشی پێ بکەن بۆ ئەوەی بتوانێ گرامێکی رادیۆمی پێ بستێنێ‌و لیکۆڵینەوەکانی لەم بوارەدا بە بەردەوام بن . . بەرامبەر بەمەش مەدام کۆری سەفەرێکی بۆ ئەمریکا کردو لەو پێشوازی‌یە مەزن‌و گەورەیە سەری سوور مایەوە . . بۆ هەر لایەك ئەچوو خەڵق بە کۆمەڵ کۆمەڵ ئەهاتنە پێشەوە و تەوقەیان لەگەڵدا ئەکرد و سەرۆکی ئەمریکاش بۆ خۆی گرامێکی رادیۆمی پی‌ی پێشکەش کرد .

لە ساڵی ١٩٣٤ دا مەدام کۆری کۆچی دوایی کردو هەتا رۆژی مردنەکەی بە رۆژێك هەر لە ناو کارگەکەی خەریکی ئیش‌کردن بوو . . هەموو رۆژێك شتێکی تازە دەربارەی رادیۆم ئەدۆزرایەوە . قوتابیان هەموو رۆژێك ئەهاتنە لای و چەندەها پرسیاریان لێ ئەکرد . بەڵام لە دوایی‌دا هەستی بە ماندوبوون کردو تیشکی رادیۆمیش کە ساغی‌و سەلامەتی بە زۆر کەسی بەخشی . هەر ئەو تیشکە بۆ خۆی ژیانی مەدام کۆری تێك دابوو . . درۆوش ناکەین گەر بڵێن مەدام کۆری ژیانی خۆی لە پێناوی رادیۆم‌دا کردبووە قوربانی . .



# زیرەکی لەنێوان رەچەڵەك و دەوروبەردا

رشيد احمد فتاح

زیرەکی هەروەکو لەکۆنەوە زانراوە توانای مێشکی مرۆڤە لە شت فێربوونو تێگەیشتندا ، بەڵام زاناکانی ئەم سەردەمە دەڵێن توانای مرۆڤە لە شت فێربوونو خۆ گونجاندن. لەگەڵ دەوروبەردا . هەندێکی کە دەڵێن توانای مرۆڤە لە تێگەیشتنی پەیوەندی نێوان بیرو شتە جیاوازەکانی دەوروبەردا . بەڵام زاناکان هەر بەمەوە نەوەستاون بەڵکو دەیانەوێ زیاتر بچنە قوڵایی مەسەلەکەوە و ئەو هۆیانە بدۆزنەوە کە کار دەکەنە سەر نەش‌و نماکردنی زیرەکی مرۆڤ ، وەك رەچەڵەك‌و دەوروبەر بۆیە دەبینین هەر کۆمەڵە زانایەك جۆرێك بیر لە مەسەلەکە دەکەنەوەو بۆی دەچن کە جیایە لەوانی کە ، بۆیە تەماشادەکەین ئەو زانایانەی لە بواری رەچەڵەکدا کاردەکەن زیاتر هەوڵ‌دەدەن ئەوە بسەلمێنن کە زیرەکی مرۆڤ میراتی‌یەو لە رێگەی دایك وباوکی‌یەوە بۆی بەجێ‌دەمێنێ‌و بەس ، وەیەکێ لەو زانایانە (ئارثەر جینسن)ە کە لەم دوایی‌یەدا ووتارێکی بلاوکردەوەو ئەنجامی تاقی‌کردنەوەکانی تێدا دیاری‌کردبوو ، بەڵام جینسن لەم بارەیەوە رەخنەیەکی زۆری لێ گیراوە ، بەتایبەتی سەبارەت بەو ئامێرانەی کە بەکاری هێنابوون‌و متمانەی کردبووە سەر ، چونکە هەروەکو زاناکان دەڵێن ئەو ئامێرانە هەرگیز توانای ئەوەیان نیە پلەی زیرەکی مرۆڤ بپێون‌و ئەنجامێکی راست بەدەستەوە بدەن . جینسن بۆ وەڵامی ئەم رەخنانە ئەوەی دووبارەکردوە کە ئەو ئامێرانە زۆر بەچاکی زیرەکی ئەو کەسانەی پێواوە کە ئەم تاقی‌کردنەوەی لەسەر کردوون هەروەها توانیویێتی پێشبینی دوارۆژی ئەو کەسانە بکات . زاناکان بەم وەڵامەی جینسن دڵنیانەبوون ، چونکە دەڵێن کە گوایە ئەم ئامێرانە ناتوانن ئەو رۆشنبیری‌یە بپێون کە ئەو کەسە لە دەوروبەرەوە وەری‌گرتوە . چونکە ئەو رۆشنبیری‌یە لەگەل زیرەکی‌یە سروشتی‌یەکە بۆتە شتێکی تێکەڵ‌و ئاڵوزاو کە ناتوانرێ بەئاسانی جیابکرێتەوە بۆیە زاناکان جۆرە ئامێریکیان دروست‌کرد کە تەنها ئەو زیرەکی‌یە سروشتی‌یە دەپێوی کە مرۆڤ لە دایك‌و باوکی‌یەوە وەری‌گرتوە . پاش بەکارهێنانی ئەم پێوەرانە زاناکان بۆیان دەرکەوت کە ئەو کەسانەی زیرەکی سروشتیان نزم بێت لایەنی روشنبیریشیان نزمە . وە ئەو کەسانەی پلەی زیرەکیان بەرز بێت پلەی روشنبیریشیان بەرزە .

جینسن توانی بەم ئەنجامە راکەی خۆی بسەلمێنێ کە دەڵێ رادەی سەرکەوتنی مرۆڤ لە ژیانا بەستراوە بە رادەی ئەو زیرەکی‌یەوە کە هەیەتی .

بەڵام ئەو پرسیارەی کە پێویستە بکرێ ، ئەوەیە ئایا رەچەڵەك لە پێکهێنانی زیرەکی‌دا تا چ چەند دەور دەبینێ ؟ لە وەڵامدا دەڵێن کە رەچەڵەك لەنیوان ٦٥٪ هەتا ٨٠٪ دەور دەبینێ ، وە ئەو زانایانەی لەگەڵ ئەم رایەدان (فرانس کریك‌و ڤارلان بورنە) یە کە هەردووکیان خەلاتی نۆبل‌یان بەدەست هێناوە ، زاناکان بۆ دڵنیابوون لەم مەسەلەیە هاتوون تاقی‌کردنەوەیان لەسەر منداڵی (جمکانە) کردوە کە بە سکێ لەدایك بوون ، ئەم منداڵانە هەریەکەیان لە جێگایەك داناوە کە جیاوازبوە لەوی دی ، پاش تێپەربوونی ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەم کارەداو تەماشایان کردوە کە هەڵس‌وکەوتی ئەم جووتە برایە زۆر لەیەك دەچێ ، هەروەها لە توانای زیرەکیاندا تا رادەیەکی زۆر یەکسانن ، ئەمەش دیسانەوە بەڵگەیەکی ترە بۆ سەلماندنی رای

زاناکانی رەچەڵەك .

یەکێ لەو زانایانەی لەم مەسەلانەی کۆڵیوەتەوە .

(وایلین هندریکسون)ە کە هەوڵی داوە پەیوەندی نێوان بایۆکیمیاوی لەشی مرۆڤو چالاکی یەکانی مێشك بدۆزێتەوە ، لە ئەنجامدا هندریکسون بۆی دەرکەوت کە ژێ دەمارەکان[٣] هەواڵەکان ئەگەینن بەشێوەیەك کە زۆر لە کاروانێك دەچێ کە بارەکەی پڕبێ لە نامەوە ئەم نامانە بە شێوەیەك نوسراوە کە تا ئێستا هیچی لەبارەوە نەزانراوە ، تەنها ئەوەندە نەبێ کە ئەم نامانە لە شێوەی شەپۆل‌دا دەجوڵێو ژمارەی ئەم شەپۆلانەش لە زیندەوەرێکەوە بۆ زیندەوەرێکی تر دەگۆرێ ، بۆ نمونە دەبینین ژمارەی ئەم شەپۆلانە لە مرۆڤو مەیمونە ژیرەکاندا (٢٢)ە و لە مشکا (١٦)ەیەو لە قرژاڵا (٩)ەیە ، لێرەدا دەبینین ژمارەی شەپۆلەکان لای مرۆڤو مەیمونە ژیرەکان لەگیانەوەرەکانی کە زۆرترە ، کەواتە بەپێی ئەم یاسایە زیرەکی گیانەوەرەکە متمانەدەکاتە سەر زۆر شەپۆلەکان . بێجگە لەمانە هندریکسون پاش تاقی‌کردنەوەی زیاتر لەم بوارەدا بۆی دەرکەوت کە تواناى ناسینو جیاکردنەوەی ئەم شەپۆلانە لە مرۆڤێکەوە دەگۆرێ بۆ مرۆڤێکی تر ، ئەو توانایەش ناودەبێنن زیرەکی .

تیوری‌یەکەی هندریکسون پێویستی بەلێکوڵینەوەو تاقی‌کردنەوەی زیاتر هەیە ، هەروەك هەموو تیۆری‌یەکی تازە . لەگەڵ ئەم هەموو را جیاوازانە بەرامبەر بە زیرەکی ، دەتوانین هەموویان لە دوو رای سەرەکی‌دا کۆبکەینەوە :

یەکەم ئەو رایەی کە بروای تەواوی بە دەوروبەرە کۆمەڵایەتی‌یەکە هەیە کە مرۆڤی تێدا دەژی لە بنیات‌نانو نەش‌ونماکردنی تواناى زیرەکی‌دا ، هەروەها ئەم کۆمەڵە لەو بروایەدان کە هەموو مرۆڤ لە تواناى زیرەکی‌دا یەکسانن ، تەنها جیاوازی‌یەکی کەم نەبێ ئەویش لە شێوەی دروست‌بونیان‌دایە ، بەڵام نەش‌ونماکردنی ئەم زیرەکی‌یەو پەرەپێدانی دەکەوێتە سەر ئەو دەوروبەرەی کە ئەو کەسەی تێدا دەژی .

بۆ نمونە دەبینین لەو کۆمەڵانەدا کە جیاوازیی چینایەتی تێدایە کۆمەڵێکیان دەورو بەرەکەی بە هەموو جۆرێك یارمەتیان دەداتو تواناى زیرەکیان زۆر بە باش نەش‌ونما دەکاتو لەناو کۆمەڵا دەردەکەون بەڵام ئەو چینانەی لە ژێرەوەن دەورو پشتەکەیان بە هیچ جۆرێك یارمەتیان نادات کە تواناى زیرەکیان دەرکەوێ و هەر ئەمەشە دەبێتە هۆی ئەوەی کە رای دووەم لەم مەسەلەیەدا بروای تەواوی بە چەند کەسانێکی زیرەك هەیە کە لەناو هەندێ لە چینەکانی کۆمەڵ‌دا هەڵ‌دەکەون ، هەڵگرانی ئەم رایە دەڵێن پێویستە هەموو ئەرکە کۆمەڵایەتیو ئابووری‌یەکان بدرێتە دەست ئەم زیرەکانەو متمانەی تەواویان پێ بکرێت لە دابین‌کردنی خۆشیو ئاسایشی ناو کۆمەڵەکە ، هەروەها ئەم کۆمەڵە زانایە دەڵێن کە مرۆڤ زیرەکی لە دایكو باوکی‌یەوە وەردەگرێ ، بە مانایەکی تر زیرەکی دەوروبەر پێکی ناهێنێو نەش‌ونمای پێ ناکا خۆ ئەگەر بێتو واز لەم تیۆریانە بهێنینو سەیری لایەنێکی تر بکەین ئەویش لایەنی سۆزە (العاطفە) کە کاردەکاتە سەر بنیات‌نانی زیرەکی منداڵ . دەبینین ئەو منداڵەی لە خێزانێکا بژی ئاسایش‌ی تێدا نەبێو باوكو دایکیان هەموو دەم لە ئیشەکانیان‌دا دواکەوتووبنو سەرکەوتن بەدەست نەهێنن لە هەموو لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری‌دا ، ئەوا ئەو سەرنەکەوتنە بە خراپ دەگەرێتەوە سەر ئەو منداڵە ، بەبێ ئەوەی منداڵەکە بەخۆی بزانێ ئەم ئاژاوەیە کاردەکاتە نەش‌ونماکردنی زیرەکیو رێرەوی لە ژیان‌دا ، جا بۆیە پێویستە هەتا بۆمان دەکرێو دەتوانین دەوروبەرێکی خۆشو پڕ لە ئاسایش بۆ منداڵ بخولقێنین بۆ ئەوەی تواناى زیرەکی سەرهەڵبداتو سوودی ببینین . لە کۆتایی‌دا دەڵێین کاری رەچەڵەكو دەوروبەر هەردووکیان دەوریان هەیە لە بنیات‌نانی زیرەکی مرۆڤ‌دا بەڵام ئەوەی ئێمە توانامان بەسەریدا دەشکێ دەوروبەرە بۆیە جارێکی تر دەڵێین پێویستە لەسەرشانمانو هەروەها لەسەر شانی ئەو کەسانەی بەرپرسیارن لە پەروەردە کردنی منداڵ هەتا دەتوانن دەوروبەرێکی وا دروست‌کەن کە منداڵ سەرلێ‌شێواو نەبێتو زیرەکی سەرهەڵبدات ، هەروەها لەپێناوی پێگەیاندنی نەوەیەکی نوێی بەتواناترو زیرەك تردا ، تا ببنە بەردی بناغە لە پێك‌هێنانی کۆمەڵێکی بەختیارو کامەران‌دا .

**ووشەگرانەکان**

١ – رەچەڵەك/الوراثە

٢ – دەوروبەر/البیئە

٣ – ژێ‌دەمار/الاوتار العصبیە

**تێبینی**

لە نوسینی ئەم باسەدا سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە

١ – ئەو ووتارەی لە گۆڤاری (الکفاح العربی) دا بلاوکراوەتەوە لەژێر ناونیشانی (هل الذكاء وراثی) ژمارەی ٩٧ – ٧٨٠ کە لە ٢١ ، ٢٧ نیسانی ١٩٨٠ دەرچوە .

٢ – گۆڤاری (العربی) ژمارەی ١٩٣ کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٤

– «ئەو غەزەلەم زور جار بەدەنگی (سەعیدی ماملێ)و (عابید) بیستووە ، پاشان کورەکانی مام سەعید بە ئاهەنگێکی خۆش گوتوویانە» . (٢٢)

● هۆنراوەکانی (وەفایی) هەرە زۆریان کراون بەگۆرانیی‌و ئاوازی تایبەتی خۆیان هەیەو لەسەر زارو زمانی گوێندەو گۆرانیی بێژانی ناوچەی موکریان‌و بگرە کوردستانن .

ئەم باوی‌و بلاوی‌یەی هۆنراوەکانی (وەفایی) ئەوە ئەسەلمێنێ کە خۆی دەستی لەو کارە هونەری‌یەدا بووە ، هەوای بۆ داناون‌و بلاوی کردوونەتەوە ، بۆیە تا ئەمرۆش چ (هەواکان)و چ (هۆنراوەکانی) وەفایی ، زیندوون‌و لەسەر زارو زمانی زۆری خەڵکی کوردن ، بەر لەوەی دیوانی (وەفایی)یان دی بێ یا خوێندبێتیانەوە ، لە قەوان‌و رادیۆو نوێ ، لە (تەلەفزیۆن)و (ریکۆردەر)ەوە گوێیان لێ‌ی بووە لەوانەشە زۆری گوێگری کورد هەر نەزانن هی کێ‌یە .

– (گۆرانیی – لەبەر نازی چاوبازان) کە مامۆستا عەلی مەردان لە ساڵەکانی پەنجادا بلاوی کردەوە ، تا ئەمرۆش زور کەس ئەو هۆنراوەیەی یا (لەبەرە) یا لە (یادە) ، چونکە سەردەمێکی زور (گۆرانیی‌یەکی باو ) بوو ، بەم جۆرە ئەوترا ،

(لەبەر نازی چاوبازان – (قوربان) خواردن‌و خەوم خوێناوە)
(بەتیری تیر ئەندازان (چی بکەم) جەرگم براوە)
(باشەو بروا سەحەر بێ (وەڵلا) باخی گولان وەبەربێ)
(گەر تۆ مەیلت لەسەر بێ –کافر ئیسلامی ناوە ! !)
(هاتم بەبۆنەی خاڵت (قوربان) تووشی داوی زولفت بووم)
تەیرێکی نابەڵە دبووم – نەمزانی دانەی داوە) . (٢٣)

● هەر ئەم هۆنراوەیە چەند دێرێکی هەڵبژاردەی بۆ یەکەمین جار بەدەنگی (سەید عەلی ئەسغەر) لەسەر قەوان تۆمار کراوە لە ساڵانی ١٩٢٨/١٩٢٩ لە (کۆمپانیای بەیزافۆن) لە تاران – لە کۆیلەیەکی هۆنراوەکەدا کە بە (مەقام)ەوە ئەیڵێ ئەمەیە

«دەستم لە تای زولفت‌دا ، بەم بەلایە نەم زانی»
«بۆ چ دەمگوژی خۆ قوربان پردی سیرات نەپساوە»

– مامۆستا عەلی مەردان بە (بەستە) ئەیڵێ . . بەستەکەی زادەی مەقامی (خورشیدی) یە کە مەقامێکی یە کجار کۆن‌و رەسەنی کوردەواری‌یە ، هەر ئەم هۆنراوەیە مامۆستا (تایەر تۆفیق)و (مەزهەری خالقی تۆماریان کردووە .

● ئەم هۆنراوەیە : (گۆرانیی شیرین تەشی دەرێسێ) .

«تایەکی ریشەی دڵ بەنووکی غەمزەدا ، دا»
«دەستێکی بۆ سەما برد ، رووبەندی ماهی لا ، دا»



«نافەی گوڵی (عەیان) بوو عەتری بەدەم سەبا ، دا»
«باریک‌و سووک‌و ناسک (دوو) زولفی خاوی با ، دا»

(هاوار ، شیرین گیان)

کە دەستی بردو هێنای بە دولبەری بە ، تا ، دا»
«وە (چەرخی خست) و گێرای ، بەرانی صافی‌دا ، دا)

(هاوار ، شیرین گیان)

عەیان بوو پەنجەی رۆژ بەخەتی ئیستیوا ، دا»
«بەسوبحی سادیق ئەنگوت ، زەنەب لەنێو سەمادا»

(هاوار شیرین گیان)

دووگمەی کراسی بەربوو) بزووت (هەوری ) بە هاری» !
«ناڵەی بە عاشقاندا باغی گوڵ‌و هەناری»
(هاوار ،شیرین گیان)

# وەفائی و گۆرانی و مۆسیقای کوردی

## بەشی دووەم

عثمان شارباژێڕی

(بەخەندە) زولفی «پشکووت» لەسەر عوزارو زاری»
«کەشەو بەیانی بەردا گوڵ‌و وەنەوشە باری)

(هاوار شیرین گیان)

● بەدەنگی ئەم هونەرمەندانە تۆمار کراوە .
(مەزهەری خالیق )و (محمدی ماملێ) و(فەتانەی وەلیدی)

ئەم هۆنراوەیەم لە گۆرانی‌یەکەی (محمد ماملێ) وەرگرتووە ،
تکایە بڕوانە ل ۱۹۲ دیوانی وەفایی /م -ع-قەرەداغی چاپی بەغداد ۱۹۷۸ ، ئەم سێ کۆپلە هۆنراوەیە ئەگەر بەراورد بکەی لەگەڵ ئەو سێ کۆپلەیەی (غەزەل)ە کە (۱۸) کۆپلەیە ، کەمێك جیاوازیان تیا بەدی دەکەی .

هۆنراوەی (گوڵێکم بوو)
«گوڵێکم بوو . لە دنیادا شکۆفەی باخی ڕەعنایی»
«لە داخی پەرچەمی شێوام . لەنێو بازاری ڕیسوایی»
«وەکوو بولبول ، بەڕووحو دڵ شەو و ڕۆژ بوومە سەودایی»
(هەموو عومری عەزیزم چوو (لەسەر ) خەندێك بە خۆڕایی»

بەجارێ ماڵی وێرانم . ئەویشم چوو ، ئەمیشم چوو .

– ئەم هۆنراوەیە کراوە بە گۆرانی لەشێوەی (بەستەدا) ئەوترێ . گۆرانی بێژ (سەید عبدالرحیم ی قورەیشی) لەسەر نەغمی (سێگا) ئەیڵێ .
گۆرانی بێژ (نەو بەری) لەسەر نەغمی (بەایات) ئەیڵێ . هۆنراوەکە . یەکە ، (هەوا)کەی بە نەغمی جوێ‌دا ڕێژراوە . ئەو هۆنراوەیە لە دیوانی وەفایی قەرەداغی – لە (ل ۱۰۵ -۱۰٦) دا هەیە بەڵام گۆرانی بێژەکان کوت‌و مت لەسەر هۆنراوەی نوسخەی (ح) کە لە پەراوێزی ئەو دیوانەدا نیشانەکراوە . ئەڕۆن .

هۆنراوەی (لە باغان ئاهو نالین دێ)
(لە باغان ئاهو نالین دێ . دەڵێن شای نێو گوڵان ڕۆیی»
«لە مەیخانان سەدای شین دێ . (دەڵێن) ! پیری موغان ڕۆیی»

ل ۲۰۵ / دیوانی وەفایی ۱۹۷۸

ئەم هۆنراوەیە (مامۆستا تایەر توفیق) کردوویەتی بە گۆرانی بە (مەقامی چوارگا)وە ئەیڵێ .
● هۆنراوەی (خۆزگەم بەوەی)
(خۆزگەم بەوەی لە دووی تۆ»
«هەر دەنوارێتە ڕووی تۆ»
«مردم بە ئارەزووی تۆ»

«قوربانی ئاشنانم»
(ل ۵۷ دیوانی وەفایی ۱۹۷۸)

حەسەن زیرەکی بەهرەمەند ئەم هۆنراوەی بە ئاوازێکەوە ئەڵێ . ئاوازەکە بەستەیەو زادەی نەغمەی نەهاوەندە . دوا جار هەمان بەستە بە دەنگی (ناصری ڕەزازی) تۆمار کراوە . ئەو دوو گۆیندەیە . هۆنراوەی فۆلکلۆری‌یان تێکەڵ کێشی هۆنراوەکەی (وەفایی)کردوە و هەموو هۆنراوەکەی (وەفایی) یان نە ووتووە .

● هۆنراوەکانی (ئەلا ئەی ساقی مەستان ل ١٤١)
(هێند نەخۆشی ل ١٨٨) غەمزەدەی خۆتم ل ١٣٠)
(سەرا بستان خەرا بستانە ئەمرۆ ل ١١٣) (وەصیەت بێ کە
مردم ل ٥٩)
(نەخۆش و مەستی ل ٦٢) (عاشق دەبێ مەستانە بێ ل ٩٩)
(گوڵەکەم دەڵێن ل ٧٠ – ٧١) (پیری مەیخانە ل ٤٨)و وبرێکی
تر لە هۆنراوەکانی (وەفایی) کراون بە گۆرانیی چ بە (بەستە) یا بە
(مەقام) ەوە بێ ، گوێندەو گۆرانیی بێژەکانی کوردستان زوربەیان
وتوویانەو بەتایبەتی ئەم هونەرمەندانە ،

(سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی) مەلا کەریم)
(عەلی مەردان) (تایەر تۆفیق) (حەسەن زیرەك)
(محمدی ماملێ) مەزهەری خالقی) (عەزیزی شاروخی)
(حەسەنی ماملێ) (سەید عەبدول رەحیمی قورەیشی)
(محمدی یاوەری) (نەو بەری) (خەلیلی صدیقی)
(ئەحمەدی زەهرائی) و (عەلی خەندان)و
«دەروێش عەبدوڵلا» . . .

– مەڵبەندی وەفایی کە شاری (سابلاخ – مەهاباد)ە چاوەو
چاوگی ئاوازی رەسەنی کوردەوارییە زووربەی هەرە زوری
(بەستە)ی پڕ جۆش و خرۆش و خۆش و خەمرە وێن لەو خاکەدا
لە دایك بووە ،

(ئەچمە سەر ناڵەشکێنە ) (لەسیلەی قەبران)
(ئاگر بارانە ) (لە سیلەی شێخ مەولانە)
(سەوزە هەی لیمو) (نازمەکە) (وای شل)
(لەرزانەکانی ) (بەلەرزانە) (کەمەرەشل)
(زێنەبێ وەی زێنەبێ ) (دیوانە بووم ) (زاوا لە بوکێ مەدە)
(بەرقەلا مەرۆ) (شاییە زەماوەندە) دیدەم زارا)
(کلۆندە) (خاڵەی رێبوار) (کلۆنجە رێ‌رێ)
(ئای لە لەنجەیە) (ئامان کورتێ) (دەنوێ دەنوێ)
(ئەو یارەم تازە بووکە) (ئەروا بەجێم دێلێ)
(هەوارە) (کۆچی یارم) (کەویار) (سەڵتەنە)
(لانکۆلێ) (بۆت دێنم) (بووك زێنێ)
(غەریب مەرۆ ) (ئامینێ چاوی) ، تۆ)و
سەدانی تر ، بۆیە مامۆستا گیو موکریانی زۆر بەجوانی بۆی ی
چووەو ئەلێ :–
«گۆرانیی و بەستەی (کۆن)و نوێ (تازە)ی کوردی تێکرا لە
٩٦٪ی لە هەرێمی موکریانیدا داهێنراوان و لەوێوە بۆ هەموو
لایەکی تری کوردستاندا پەخش و بلاو بوونەوە .»

١٢٥ دیوانی وەفایی / گیو موکریانی ١٩٦٢
زۆر لەو (ئاواز) و (هەوا) یانەی ناوچەی موکریان ، جێ
پەنجەی هونەرمەندی لێ‌هاتووو بەتوانای پێوە دیارە .
مۆرو مارکەی گەرووبەکی رەسەنی کوردانەیان پێوەیە ، کە
مۆسیقاو ئاوازی کە لە هاوسایەو هاوسێکانی تری کورد ،
کاریان نەکردوونەتە سەر ، بێگومانم کە دەستی هونەرمەندانی
خوێندەوارو (نەغمەزان)و (پەردەناس)و (مۆسیقازان) لەم کارو
بارە هونەرییەدا هەیەو
– (وەفایی) یەکێکە لە شۆرە سوارانی ئەو مەیدانەی هونەری
گۆرانیی کوردیدا ، سەبارەت بە زانایی و ئاشنایی (وەفایی) لە
گۆرانیی و موسیقادا بەکورتی لەم چەند هۆنراوانەی خۆیدا
تروسکەی بەهرەی ئەو هونەرمەندەمان بۆ دەرئەکەوێ ، کە لە
زۆر هۆنراوەکانیدا ، بابەتی (گۆرانیی و مۆسیقای) تێدایە .

● (مطرب) وەرە دەستی من و دامانی وەفات بێ)
(سوتام و بم‌ئەستێنەوە ، با ، دەنگیی (نەوا) ت بێ)

ل ١٧٦ دیوانی وەفایی – ١٩٧٨ بەغداد

(مطرب = گۆێندە :–
– گۆرانیی بێژێکی هەڵکەوتوویی بەهرەمەندە ، (پەردەناس)و
(مەقام زان)ە لە (بەند)و (بەیت)و (بەستە)دا شارەزایە ، لە
(ووتن) داگۆیاو پشوو درێژو بەتوانایە ، دەنگخۆش و بەزمارایەو
پیشەی گۆرانیی ووتنە .

(نەوا) =لە زاراوەی مۆسیقای رۆژهەڵاتیدا بەو (پلە) ی
دەنگییە ئەو ترێ کە ئەکەوێتە نێوان (پەردە) ی(حسەینی)و
پەردەی (چوارگا)وە .
– (نەوا) =وەڵامی پلەی یەکگایەو بەرامبەر دەنگیی (سۆل)ە
لە پەیژەی مۆسیقای رۆژ ئاواییدا .
– نەوا = لە زاراوەی مۆسیقاداو لە پەیژەی موسیقادا بە
پەردەی (پێنجگا) ئەوترێ .
– نەوا = یەکێکە لەمەقامە کۆنەکانی کوردەواری و میللەتانی
(فارس) و (عەرەب) و (تورك)یش ئەو مەقامەیان هەیە ئەو

مەقامە لە (نەوا) وە دەست پێدەکا بەرز ئەبێتەوە بۆ پلەی (ئەوج) ئەگەڕێتەوە سەر (نەوا) لە نزم بوونەوەدا پەردەی

– (چوارگا) و (سێگا)ی تێ دەکەوێو
مەقامی (حیجاز)ی تێ ئەکەوێ لەسەر پلەی (دووگا) ئەو مەقامە کۆتایی دێ .

● (هەر ڕەگێکم (دەنگ)و «ئاواز»ێکی لێ دێ پڕ
خرۆش)
(ئاورت بەرداوەتە عالەم بە (مۆسیقار)ی خۆت)

ل ٣٢ – وەفایی – م.ع-قەرەداغی ١٩٧٨

● مۆسیقار :–
لەزاراوەی مۆسیقای ئەمڕۆی جیهانیدا بەرامبەر بە (فەیلەسوف) دێ ، بەو کەسە فرەزانو فەیلەسوفەی (مۆسیقا) ئەلێن کە بەهرەمەندێکی بێ وێنەو خاوەن توانایەکی سەر سورمینەربێ لە (داهێنان) و (درووستکردنی) ئاوازی ناوازەی مۆسیقادا ، لێکۆڵینەوەو دیراسەکردنێکی درێژ خایەنی ووردو لە باری هەبێ لە زانستی موسیقاداو بە (دانان) و (لیدان)و (نوسینە)وەی مۆسیقا ، بەرو بەرهەمی هەبێ ، خاوەن شاکاری مۆسیقایی بێو ئاوازەکانی لە جیهاندا ، دەنگیان دابێتەوە .
بۆ نمونە ، بە (بتهۆڤن)و (موزارت) و (هایدن) (شۆپان)و (رۆسینی) و (ئارام خاچادۆریان) ئەوترێت (مۆسیقار) ، ئەو پلەو پایە هونەری‌یە لە شکۆیی‌و شایانی بەهرەی خۆیاندا وەریانگرتووە ، و پێ‌یان دراوە .
– هەر کەسێك ئامرازێکی مۆسیقا یا چەند ئامرازێکی زانی لێبدا بە (مۆسیقار) دانانرێ . و بەڵکوو مۆسیقا زانە .
● (مۆسیقار) : ئامرازێکی فووکاریی کۆنی مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی یەکە بە هۆی (فوو) ، ئاوازی لێ دەرهاتووەو مەبەستی وەفایی لە هۆنراوەکەی‌دا ئەم ئامرازەی گرتووەتەوە .
● ئاواز :– لە ئەمڕۆی هونەریی گۆرانیی و مۆسیقای کوردیی‌دا لە جێ‌ی (لحن)ی عەرەبی بەکار دەبرێت .
(ئاواز) – لە کۆمەڵە نەغمەیەکی ڕێكو پێکی مۆسیقایی لێکترجودا لە (گڕی)و (تیژی)و (بەرزی)و (نزمی) و خاوەن کاتێکی (تاکتدار) پێك دێت ، هەرکات نەغمەکان واتە داربوون لە ڕازێکدا توابوونەوە ئەبنە ئاوازێکی گۆرانیی .

(ئاواز) – بە (مەقام) و (لقەمەقام) ئەوترێت

(ئاواز) – لە زاراوەی موسیقایی ڕۆژهەڵاتی‌دا بەئەم مەقامانە (گۆشت – نەورۆز – سەلمك – کوردانی مایە – شاناز ) ووتران ئاواز .

● (دەنگی منو سەوتی تۆ ، بۆ (بەزمی خوسرەی»
«–چەنگ – و– نەی– و عود–و – دەف–و – تار–و–شاناز –ن»

٨٩ دیوانی وەفایی /قەرەداغی

(چەنگو عودو تار)
– سێ ئامرازی (ژێداری )مۆسیقای ڕۆژهەڵاتین
● (نەی :– ئامرازێکی (فووکاری) مۆسیقایە) .
● (دەف) :– ئامرازێکی (ئیقاعی) مۆسیقایە .

بەزم) : لەبارەی زمانەوە بە ئاهەنگ گێڕانو گۆوەندو ڕەزمو ڕابواردن دێ .
لە بارەی زاراوەی مۆسیقاوە بەرامبەر ووشەی (بیزیکاتۆ)ی ئیتالی دێ لە موسیقای ڕوژاوایی‌دا .
کە بەهونەری پەنجە بازی بەژێی ئامرازە ژێدارەکانو دەرهێنانو پێك هێنانی ئاوازی دڵنەواز .
● (بەزمی خوسرەوی) کۆڕی ئاهەنگی شاهانەو شەوانەی (کەیخو سرەو)ە کە مۆسیقازانو گۆیندەی بەناو بانگ (بارە بود) بۆی ڕازاندووەتەوە هەر شەوە ئاوازێکی نوێو لە شەوێ پێشوو تر جوێ‌ی بۆ ووتووە .

بڕوانە (ل ٢٤) لێداونێکی کورت لەمەقامو مۆسیقای کورد ١٩٧٢/

– (شاناز) :–
لە پەیژەی مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی‌دا بەو پلەی (دەنگی)یە ئەوترێ کە کەوتووەتە نێوان پلەی دەنگی (گردان)و (موحەیەر) .
بەرامبەر (ڕێ بیمۆڵ)دێو نەغمەی (ڕێ بیمۆڵ)ە ، بە بەراوردکردنی نەغمەکانی پەیژەی مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی لەگەڵ نەغمەکانی پەیژەی مۆسیقای ڕۆژاوایی .

– (شاناز) :–
– یەکێکە لەمەقامە کۆنەکانی رۆژهەڵاتی‌و ئەڵێن مەقامێکی فارسی‌یە ، ئەم مەقامە لە (موحەییەر)ەوە هەڵ ئەستی‌و (شاناز) و (ئەوج)ی تێ دەکەوێ ، لە نزم بوونەوەدا ئەگاتە (نەوا)و (حیجاز) وەرئەگرێ ، دواجار لەسەر پەردەی دوگا لەنگەر ئەگرێ .
(بروانە ل ٢١ لێداونێکی کورت لە مەقام مۆسیقای کورد)١٩٧٢ .

– (موغەنی) کوانێ «ئاهەنگ»ێ ؟ (حیجاز) و (بەربەط) و (چەنگ)ێ .
(سێتا)ی (مطرب)(سەدا)بۆ کەوت ؟لەبەرچی ؟دەنگی (نەی)نایە .

ل ١٦٦ – دیوانی وەفایی/قەرەداغی
– (موغەنی)گۆرانیی بێژ.
– (ئاهەنگ) : لەبارەی زمانەوە ، بەکۆری گۆوەندو گۆرانی‌و بەزم‌و رەزم دێ لە دەمەی شادیی‌و ژن هێنان‌و شووکردن‌و شەوارەی منداڵ بوون‌و خەتەنە سووران) ئەگێردرێ .
– لە بارەی زاراوەی موسیقاوە ،
بە پێکهێنان‌و سازکردنی ئاوازی مۆسیقا گۆرانیی ئەوترێ لە نەغمەو نەوایەکی هونەری بەرزو باڵادا ، کە دڵنەوازیی‌و بەزم ئاوەریی‌و شادی هێنی تێدابێ !

(چەنگ‌و بەر بەطو سێتا)
● «سێ ئامرازی مۆسیقای ژێداری رۆژهەڵاتین . (بەربەط)لە داهێنان‌و درووستکردنی (بارەبود)ی گۆیندەو موسیقازانی شاهان‌و شەوانەی (کەیخو سرەو)ە .»

● (حیجاز) لە زاراوەی مۆسیقادا بەو (نەغمە(یە ئەڵێن کە ئەکەوێتە نێوان نەغمەی (چوارگا)و (نەوا)وە ، بەرامبەر نەغمەی (فادیز)ی مۆسیقای رۆژاوایی دێ .

● (حیجاز)
یەکێکە لەمەقامە بەناو بانگەکانی گەلانی رۆژهەلات ، کەلەم (پەردە – نەغمە)و پلانە پێك‌دێ .

(دووگا – کورد – حجاز – نەوا– حسێنی – ئەوج کوردان – موحەیەر) ولە موسیقای رۆژاوایی‌دا لەم نەغمانە پێك دێت .
(رێ – می بیمۆڵ – فادیز– سۆڵ – لا – سی بیمۆڵ – دۆ – رێ)
– (دیسان بە (نەغمەی ) (زیروبەم) ، بولبول دڵی بەدەردو غەم)
(لە ئاوی غونچەی گوڵ بەدەم ، (ساز)و (سەمتوور)و (تار)ی گرت .

ل ٢٥ – دیوانی وەفایی .
● (سازو سەنتورو تار) .
● سێ ئامرازی مۆسیقای ژێداری روژهەڵاتین . .
● (نەغمە)– لە بارەی زمانەوە ، بەکوردی بەرامبەر (لۆرە) دێ .
– لەبارەی مۆسیقاوە .
● (نەغمە) : دەنگێکی سادەی بێ ووشەیە ، (نەغمە) وەك (پیتە) و (ئاواز) وەك ووشە ، ئاواز لە چەند نەغمەیەك پێك دێ .

● (زیرو بەم) .[٢٤]
زیر– یەکێکە لە ژێکانی عوود بەژێ باریکەکەی ئەوترێ ، کە دەنگێکی ناسك‌و زیری هەیە .
بەم : یەکێکە لەژێ ئەستوورەکانی عوود . دەنگێکی گڕو قەبە ئەدا .
(زیل) : ئامرازێکی ئیقاعی مۆسیقای رۆژهەڵاتی‌یە .

– بەشینی عاشقان ، رەسمی قەدیمە
شایی مەعشوقان ،
بەلەیلێ (نەغمە)ی (عوششاق)ە
ئەگەر مەجنوون بناڵێنێ .
ل ٢٠٤ دیوانی وەفایی /١٩٧٨
–«نەغمەی عوششاق = مەقامی عوششاق»
– مەقامێکی کۆنی رۆژهەڵاتی‌یە پڕە لە سۆزو خرۆش ، (خۆش‌و دڵکێش)ە .
گۆرانیی بێژەکانی (کورد) و (فارس) و (عەرەب) و (تورك) بەو مەقامە ئاشنان ، ووتوویانەو زۆربەیان لە ئەمرۆدا تۆماریان کردووە . لەو هونەرمەندانەی کورد کە تۆماریان کردووە مامۆستا

(عەلی مەردان) (تایەر تۆفیق) (رەسوڵ گەردی) (عەزیزی شاروخی) (مەزهەری خالقی) (حەسەن جەزراوی) (نەسرین شیروان) (حسین عەلی) (کوێستانی) .

-(عوششاق) - لە رەگەزی مەقامی (بەیات)ە تەنیا لەدابەزین‌دا مەقامی (راست)ی تێدا دەردەکەوێ و ئەیگۆڕێ بەمەقامێکی نوێ‌و پی‌ێ ئەوترێ (عوشتاق) .

بروانە ل ١٨ - لێدوانێکی کورت لەمەقام‌و مۆسیقای کورد)

● هەزار ، تا ، زولفی ، وەك (ساز) ێك
بەناز بۆ (نەغمە پەرداز) ێك
کەهەر (ساز)ە بە (ئاواز)ێك
دوو دنیای پڕ لەغەوغا کرد .

ل ٣٤ دیوانی وەفایی/١٩٧٨

- (ساز) - یەکێکە لەئامرازە ، ژێدارەکانی مۆسیقای رۆژهەڵاتی

(ساز) : بەم ئامرازە مۆسیقاییانە»

(قانون - عوود - چەنگ ، تەنبوور» بەربەت) ئەوترێ «ساز» .

(ساز) لە زاراوەی کۆنی مۆسیقای رۆژهەڵاتی‌دا بەواتەی (ئاواز) و (دەنگ) هاتووە .

● نەغمە پەرداز = نەغمە خوان ، گۆرانی بێژ.

**پاشکۆو پەراوێز**

١ - ل ٢ دیوانی وەفایی - مامۆستا گیو ١٩٦٢

٢ - ل ٥٤٣ (دێری ٦) مێژووی ئەدەبی کوردیی ١٩٥٢

٣ - رۆژنامەی (ژین) ژمارە (١٣٠٣) ١٩٥٦

٤ - ل (چل وچوار) دیوانی وەفایی قەرەداغی ١٩٧٨

٥ - ل (سی‌و سێ) سەرچاوەی پێشوو .

٦ - ل (چل‌وچوار) سەرچاوەی پێشوو .

٧ - ل (پەنجاو چوار) سەرچاوەی پێشوو .

٨ - (پیرە مێرد)ی نەمر ، زۆر سەید ئەحمەدی خانەقای لەبەر دڵ بووە ، خۆشی‌ویستووە ، هەر لەهەمان ژمارەی (ژین - ٨٩٢) ئەڵێت :

- کە لە ئەستەمبووڵ هاتمەوە کردبووم بەعادەت ساڵی (٣) رۆژ بەتایبەتی ئەچوومە خزمەتی .

- ئەم بەرە جەژنانە ئارەزووی زیارەتی کێشی‌کردم ئێوارەیەکی جومعە گەییمە (خانەقا) ئەو لەماڵەوە نەبوو ، نانیان بۆ دانام پشتم لە رێگاکە بوو ، خەبەریان دا بوویە هات ، چاوم لێ نەبوو ، لە پشتەوە دەستی خستە سەر شانم ، هات بەدڵما بەنوکتەی جاف بێمە پێشەوە هەروا لەخۆمەوە ووتم ، لەپشتەوە دەستت هاویشتە سەرشانم ، نەفسی عەزیز خۆیشی لێ پاییزە لێت ناترسم ، فەرمووی نەختێ گوێم گران بووە ، عەرزم کرد قوربان منیش کەڕم بە ئیملای کۆن (کەڕاو کەڕ) کەوتووین ! !

(ل ٢ ژین ٨٩٢)

هەروەها نزاکەی پیرە مێرد گیرابووە (سەید ئەحمەدی خانەقا پیرە مێردی ناوەتە چاڵ ، دوو ساڵ دوای پیرە مێرد کۆچی دوایی کردووە ، (رۆژنامەی ژین) لەکۆچی دوایی ئەو کوردە چاکە پاکەدا نووسیوێتی :

«هەموو جارێك مەرگ دەستی درێژ ئەکاو یەکێکمان لێ کەم ئەکاتەوە ، کەلە بەرێکمان تێ ئەخا ، بەڵام ئەمجارە چەشنی هیچ جارێك نەبوو ، کە لەبەری خستە ناو پیاوە ، بەنرخەکانمانەوە کە ناتوانین لەبیرمان بچێتەوە ، کۆچی (سەید ئەحمەدی خانەقا) بەراستی ماتەم باری کردی .

(ژین) ژمارە (١١٤) ئەیلول ١٩٥٢

(٩ - ١٠)

ل ٤٦ دیوانی وەفایی ١٩٧٨

١١ - هۆنراوەی مەولەوی گۆڕینی پیرە مێرد

١٢ - دیوانی زێوەر ، ل ٢٦

١٣ - لە یەکێك لە ژمارەکانی رۆژنامەی برِوادا بلاوکراوەتەوە ( ؟) .

١٤ - ل ٢٧ دیوانی زێوەر .

١٥ - ل ٣ دیوانی وەفایی/مامۆستا گیو .

١٦ - ل ٤ سەرچاوەی پێشوو

١٧ - بلاوکراوەی رۆشنبیری نوێ (ژمارە - ٣٩) - ١٩٧٥

١٨ - ل ٤ دیوانی وەفایی - چاپی هەولێر

١٩ - ل ٤ هەمان سەرچاوەی پێشو .

٢١ - ل سی‌وسی‌و سی‌و چوار دیوانی وەفایی قەرەداغی

٢٢ - ل ٥٠ سەرچاوەی پێشوو

٢٣ - ل ١٥١ دیوانی وەفایی قەرەداغی

٢٤ - بۆ هەندێ زانیاری وزاراوەی مۆسیقا کەڵك‌لەم سەرچاوانە وەرگیراوە :

أ - الموسيقى الشرقيه : كامل الخلف

ب - الموسيقى النظريه : سليم الحلو

جـ - لێدوانێکی کورت لەمەقام‌و موسیقای کورد/عثمان شارباژێری

د - گەنجینەی گۆرانی کوردیی/دەستنوسە .

# بشێ گەڕانەوەی گەنجی کارێکی سانا بێ ؟

مردنی سەرۆکی یوگسلافی مارایشال تیتۆ سەرباری قسەی پزیشکەکانی ئەوروپای رۆژئاوا بە تایبەتی لەم هەفتەیەدا پزیشکەکان گەڕانەوە بۆ سەرەتای نەخۆشی‌یەکە کە ماریشالی لە پێ خستو هەوڵی دۆزینەوەی گیرێو تێکچرانە پزیشکی‌یە بوون کە پەیوەندی گیرسابو . بۆ دۆزینەوەی ئەو نهێنیە کە وای کرد ماریشالی پیر لە ڕوی مەرگدا سەدو بیستو دوو رۆژ بەرگری بکاتو خۆی ڕاگرێ . . ژیانی ماریشال لە سەردەمی نەخۆشیەکەیدا وەکو هەتاوی مانگی شوباتبوو ، کە هەندێ جار دەبریسکایەوەو دەردەکەوتو بە هێزبو ، هەندیشی نەدەخایەن لاوازیو گرژی دایدەگرتو لە پشت هەوری ژاندا لەبەر چاو وون دەبو . .

پزیشکێکی فەرەنسی بەشداری کرد چاودێری کردنی تەندروستی ماریشال کاتێ کە لە نەخۆشخانەی «لجوبليانا»ی یۆگسلافی‌دا . لە پاریسدا ئەو نهێنیەی ئاشکرا کرد چۆن ماریشال لە ڕوی ئەو نەخۆشییەدا خۆی گرتووە . . پزیشکەکە سەلماندی کە ماریشال ی پیر لە ڕابوردوودا «عەمەلیاتی — گەڕاندوەی گەنجییەتی » کراو کە زۆربەی دەوڵەمەندانی جیهان ئەم عەمەلیاتە دەکەن . . ئەم لە ئاکامی ئەمەدا جەستەی ماریشال ئەم هێزو خۆگرتنە وە دەست بێنێو ئەو جەستە پیرە خۆ بە ژیانەوە بگرێ وەك ئەوەی لە تەمەنی پەنجا ساڵەدا بێ . ئەم ڕووداوە دوو سییەی لایەنی پزیشکی لە عەمەلیاتی «گەڕاندنەوەی گەنجیەتی» کردەوە ناوی کە سانێکی زۆر کەوتە

بەر چاوەوە پەنایان بۆ ئەم شێوەیە بردووە تا بە هەموو هێزێکەوە بمێنیٚ بۆ ئەوەی بەر پرسیاری کارەکانی بیت . .

گەورەترین کەسێکی جیهانی ، سەرۆکی سۆڤیاتی لیۆنید برجنیف ، هەموو وەبیرمان دی کە چۆن سیاسی‌یەکان چاوەروانی کۆتای هاتنی برجنیف –یان دەکرد ، کاتیٚ کە هەواڵەکان وایان دەگەیاند کە تەندروستی‌ی بە تەواوی تێك‌چووە . وەلی سەرۆکی سۆڤیاتی‌سەر لەنویٚ کەوتە گورو دەرکەوت پاش ئەوەی قومێکی دی‌ی «گەراندنەوەی گەنجیەتی» هەڵقوراند . .

**گەنجیەتی یا گور : ؟**

ئەلکسی کۆسیچین –یش یەکە لەوانە کە چێژی لە «گەراندنەوەی گەنجیەتی» وەرگرتووە . بە وەی کە چەن مانگیٚ لەسەر شانۆی سیاسەتی سۆڤیەت دیار نابیٚو لە پر دەردەکەویٚ . لە کەسانی مێژووی کە توانییستی بەرگری بکات‌و خۆی راگریٚ بە هۆی تیماری «گەراندنەوەی گەنجی» بابا بیوسی ی دوانزەهەم‌و سەرۆکی بەریتانی ونستون تشرشل . هەروە ها سەرۆکی یۆگسلافی تیتو . .

شایانی باسە پزیشکەکان سیٚ لە رستەی «گەراندەوی گەنجیەتی» دەکەن . و بە تەواوی نازانن بەوەی کە گەراندنەوەی گەنجیەتی لە راستیدا کارێکی موستەحیلە . بۆیە پزیشکەکان بە چاکی دەزانن رستەی «گەراندنەوەی گور» بەکار بهێنریٚ چۆن دەشیٚ گور بگەرێتەوە گەر جەستەی ماندوو لە ژێر زنجیرەیێك تیماری پزیشکی تایبەتیدا بیٚ . . .

پزیشکەکانیش لەو باوەرە دەردەپەرن کە جەستەی مرۆڤ خولقاوە بۆ ئەوەی سەدو دە ساڵ بە تەواوی بژێت . دەلیٚ نەخۆشی‌و ماندووبوون کە تووشی جەستەی دەبیٚ ئەم تەمەنە کورت دەکاتەوەو دەیخاتە ژێر رکێفی ئەو زروفەی تیایدا دەژیٚ . .

پزیشکی نویٚ جەستەی مرۆڤ دەچوێنی بە ماتۆری ماشین کە داهێنراوە بۆ بەرگری کردن لە روی گەرماو سەرماو هەڵەی شوفێرو شتی‌دی ئەو ژمارە بنەرەتی‌یە کەم دەکاتەوە بە پیٚ‌ی پێوەرێکی کەم تا کورتی . ماشینەکە لە کار دەکەویٚ پێش ئەوەی پیری‌و پێکەوتەیی بگاتە تەمەنی . .

ئەرکی تەندروستی نوێ‌ی خاوەن کاری تایبەتی بۆ گەراندنەوەی گورو گەنجایەتی لەوە دایە کە رووداوەکانی دەرەوە کەمتر کار لە مرۆڤ بکات تا (ماتۆر) ەکەی بەرگە بگریٚ تا کۆتای ئەو ماوە زەمەنی‌یە دیاری کراوە . . بەم شێوەیە ئامانج یەکەو روونە وەلیٚ ئەو شێوازو ری‌یانەی بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنریٚ دەگۆریٚ بە پیٚ‌ی گۆرینی تیورەکانی پزیشکی کە ژمارەیان شەش تیورە کە لە نێوان باوەرهێنان بە شێوە سەنعەتیەکان‌و یا پەنا بردنە بەر مەناعەی سروشتی‌یە . . گرنگ ئەوەیە ئەمە بزانین هەندیٚ تیور هەن هەموو پزیشکەکان بۆ سود وەرگرتنی کۆدەکاتەوە وەلیٚ هەندیٚ تیوری دی هەیە کێشە دەنێتەوە هەندیٚ پزیشك باوەری پیٚ دەهێنی‌و هەندێکی دیشیان خۆی لیٚ دور دەگرن . . ئەو شێوازەی کە پزیشکەکان کۆ دەکاتەوە ئەو ریٚ‌یەیە کە پەنا دەباتە بەر جۆرێکی دیاری‌کراوی خواردەمەنی :

پرۆفیسۆر جیا نولی یاسای خواردەمەنی جیهانی بە خەراپ لە قەلەم دەدات . دەشیٚ زامنی ژیانێکی ئاسایی بە هەزارو پێنج‌سەد وەحدەی حەراری لە ریٚ‌ی خۆراکەوە لە رۆژێکدا بکریٚ . .

لەم وەحداتانە پێویستە لە سەدا پەنجای خۆراکەکە لە پرۆتینەوە «وەك گۆشت‌و ماسی» و لە سەدا بیست لە چەوری درەخت‌و لە سەدا سی لە سەوزەو مێوەی گەیوو نویٚ . . هەروەها پێویستە بۆ یەکجاری لە سپرتۆ دورکەوتنە وە مەرجە . بەلاّم دوورکەوتنەوە لە بەزو چەوری ئاژەل زۆر زۆر پێویستە .

یاسای خۆراکی نویٚ پەنا دەباتە بەر دوو رێچکەی سەرەکی ئەوانەش : جۆارو جۆری خۆراك‌و دەست نیشان‌کردنی چەنیەتی سپرتۆ . بەلای ئەوەوە سپرتۆ کاری ئەوە دەبینیٚ پیریەتی پێشخا . .

خۆراکیش دەبیٚ دابەش کرێتە سەر چەن جۆرێك بۆ ئە وەی جەستە پیویستی خۆی لە هەموو ڤیتامینەکان هەلمژیٚ . . ئەم ری رەوەش وای داناوە کە هەموو سەنگی (قەڵەو) بوون لە پاش تەمەنی ٣٠ ساڵە جەستە وە دەستی بێنیٚ ناشیٚ تەنها بۆ زیانە . دەبێتە هۆی شەکری‌و نسبەتی کویستیرۆل زیاد دەکات‌و بەری دەمارەکان دەگریٚ .

بۆ دوژمنایەتی کردنی ئەم ترسناکی‌یە پێویستە لە هاوریاتی «قەڵەو» بوون خۆ دورگرین . ئەم هاوریٚ یە چ نیە جگە لە بەزو پیوی ئاژەلیٚ . بەم ئاکامەش دەگەین گەر لە بری کەرەو رۆنی نەباتی (مەرغرین) بەکاربێنین‌و لە بری رۆنی زەیتون «سوجا» هەروەها دەتوانین لە بری گۆشت . گۆشتی ماسی بە کار بهێنین . . هەروەهاو ریٚ‌ی دووەمی قەڵەوی شەکرە کەریٚ مورەباو شیرینی‌و شەکرۆکە بەکار دەهێنین . . دەتوانین پیویستمان بۆ شەکر لە ریٚ‌ی مێوەو سەوزەو نان‌و شیرو شتی دی وە دەستی

بێنین . .

پەیڕەوی کردنی ئەم یاسایەی خۆراك جەستە لە نەخۆشی دور دەخاتەوە وەك دەزانین نەخۆشی دەبێتە هۆی شەکەت کردنی جەستەو بەرەو پیری‌و لێکەوتنی پێش‌کاتی خۆی دەنێرێ .

لە پاڵ ئەم شێوە ئاساییە ، شێوەیێکی دی هەیە پەنا دەباتە بەر وەرزشی جەستە ، وەرزش پێویستە بۆ جەستە چۆن دەبزوێنێ . . نەبزوتنی دەبێتە هۆی گرژبوونەوەی ماسولکەو ئێسقان ئەنجامیشی بەزۆری کالیسیۆمی لێ دەردەچێ‌و بەرگری جەستە کەم دەبێتەوە نەخۆشی ڕوی تێ دەکات لە کۆتاییشدا بەرەو پیربوونی دەنێرێ !

هۆرمۆنات‌و شانەکانی

سەرباری ئەم دوو شێوە ئاساییە ، هەندێ شێوەی جۆراو جۆری دی هەیە ، لەوانەش ، بەکار هێنانی هۆرمۆنات‌و لە جەستەدانی ، وەلێ ئەم ڕێڕەوە کە پرۆفسیۆری فەرەنسی ئەلبێر ناشر پەنای بۆ دەبات تەنها بۆئافرەت بە کەڵکە «پیربوونی سێکسی‌ی» دوا دەخات کە ژنان بە چاکی دەزانن کە لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا ڕوو بەروی دەبنەوە . . شێوەی هۆرمۆنات سەرکەوتووە کە دەساڵ ئەو جۆرە پیربوونە دوا دەخات . .

دەوری پزیشکی شانەکان دێتەکایەوە پەرە بە ڕێچکەی چوارەم دەدا کە «گەنجیەتی» دەگەڕێنێتەوە» ئەم ڕێچکەیە پەنا دەباتە بەر چاندنی شانەکانی ئاژەڵی لە جەستەی مرۆڤدا . .

پرۆفیسور «کیانت» لە دانشگای ڤیەنای پزیشکی سەلماندی کە ، ڕێچکەی چاندنی شانەکان لەسەر مێش ئەنجامی چاکی وە دەستەوە داوە . دەڵێ : وزەی پیاو بەرەو کزبوونەوە دەچێ لە تەمەنی سیو پێنج ساڵەوە وەلێ گوڕی تیادا دەمێنێ تا تەمەنی پەنجاو پێنج ساڵ‌و پاشان . . . بەرە بەرە بەرەو نشێوی دەکشێ . . بەپێ سەرنجی «کیانت» مرۆڤ دەتوانێ تا پاش سەد سالیش بژێ وەلێ کارەکانی دەرەوە دەلەوتێنێتەوە . . سیرتۆ ، زۆر خواردن‌و بێ کەڵکی جۆریان ، ڕارای‌و گرژبوونەوە . . ئەمانە هەموو دەبنە هۆی زوو پیربوون پرۆفیسۆر بەکورتی دەڵێ .

مەبەستم درێژکردنەوەی ماوەی گورە بۆ ئەوەی ژیان پڕ مانا بێ بۆ ئەو ئینسانانەی بە تەمەنن ، کاتێ ناحەزانی ئەم ڕێچکەیە دەڵێن کە ئەمە دەبێتە هۆی دوو چار بوون بە نەخۆشی شێرپەنجە ، پرۆفیسۆر کیانت بە توندی بەر پەچی ئەم قسەیە دەداتەوە دەڵێ :

ئەمە ڕاست نی‌یە (بە پێچەوانەوە) مرۆڤ گەر پیربوو دژ بە شێرپەنجە بەرگری نامێنێ ، شانەی نوێ‌و بە هێزی بدرێتێ بەرگرییەکەی زیادەدەکات‌و کەمتر توشی دەبێ ، شانە لێدان ، بێ هیچ گومان پروتین لە جەستەدا دەچەسپێنێ‌و باری تەندروستی گشتی چاك دەکاتەوە !

جەنین ــی بەرخ :

پێنجەم ڕێچکەیش چەن جۆرێکە لە ڕێچکەکانی دی زیاترە ، ئە میش پەنا دەباتە بەر دەرهێنانی «شانە» لە جەنینی بەرخ‌و لە جەستەی مرۆڤ دەدەن ، ئەم ڕێچکەیە تەنها لە ئەلمانیادا بەکار دەهێنرێ‌و لە ئەمریکاو فەرەنسا قەدەغە کراوە . .

پزیشکی ئەڵمانی جواشیم «یواکیم» ستاین ٢٦ ساڵە بەڕێوەبەرایەتی مەلبەندی پزیشکان دەکات کە پەنای بردووەتە بەر ئەم ڕێچکەیە .

ستاین دەربارەی شارەزایی خۆی دەدوێ‌و دەڵێ :
نزیکەی ١٥ هەزار کەسم لە تەمەنی جۆراو جۆردا بەم ڕێچکەیە تیمار کردووە ، هەر لە دە ساڵانەوە تا هەشتاو شەش ساڵی ئەم ڕێچکەیە نایابە گەر لە حاڵەتێکدا «غودەی دەرەقی‌و ئیفرازاتی جەرگ‌و نەخۆش ماسولکەکانی دڵ لە کاریانی خستێ : لە وەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی کاتی تیمارکردن ، ستاین دەڵێ چاکترین تەمەنێ بۆ ئەم کارە تەمەنی ٤٥ ساڵی‌یە کە دەتوانین لێکەوتەیی شانەکان بەووردبوونەوەی وردی پزیشکی دەست نیشان بکەین . دەڵی ئەم ریچکە ئەڵمانیە دراوێکی زۆری تێ دەچێ بۆیە بۆ دەولەمەندانە . . . نرخێ بەرخەکان بۆ تیمارکردنی کەسێ دەگاتە دە هەزار دولار ، حەق دەسی پزیشك‌و کرێی نەخۆشخانەش دوو سێ ئەوەندەی ئەم دراوە شی دەبێ بە جۆرێ گەڕاندنەوەی گوڕ بۆ کەسێ سەدهەزار دۆلاری تێ دەچێ ، . لە ڕابووردوودا تیمارکردن بە حەقن ــ بە جەنینی بەرخ دەکرا بەوەی لە دەمارە بیمارەکان دەدرا . وەلێ ئێستا لە ژێر پێستە دەدرێ‌و جەستەی مرۆڤیش بەو شانە نوێیانە قایل دەبێ وەلێ سودی ئەم کارە پاش سێ‌مانگ دەردەکەوێ ماوەی دەرزی لێدانەکە نزیکەی شەش مانگێکی دەوێ . . لە ساڵی ١٩٦٧ لە ئەڵەمانیادا هەزار پزیشك هەبوون پەنایان دەبردە بەر ئەم جۆرە تیمارکردنە بەلام ئێستا ژمارەیان گەیشتووەتە شەش هەزار پزیشك . . ئەمە ئەوە دەنوێنێ نزیك‌بوونەوە وبەرەو پیر چونی ئەم ڕێچکەیە سێ‌جار بەقەد خۆی زیادی کردووە لەم چوار ساڵەی ڕابوردوودا ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ئەوانە قایل بەم جۆرە تیمارە ریچکەی ئەڵمانیان زیاتر لا پەسەندە .

**مەدام ئەصلانو پرۆکایین :**

شەشەم ریچکە کە کەسانێکی زۆری گرتووە تە خۆی ئەویش رێچکەی مادام ئەصلانە . . پزیشکە فەرەنسی‌یەکان بە دڵنیاییەوە دەڵێن سەرۆك تیتۆ بە هۆی عەملیات کردن لەسەر ئەم رێچکەیەی مادام ئەصلان ئاکامێکی چاکی وە دەست هێنابو ولە گورو جۆشیا رەنگی دابووەوە . . ریچکە ی خاتوو ئەصلان پەنا دەباتە بەر «حەقن» و حەبی پروکایین ، پرۆکایین «مادەێکی» پزیشکی‌یە کار دەکاتە سەر دەرمارەکان هاتو چوی خوین بە جۆش دەکات ، وەك زانراوە بە جۆشی هاتو چوی خۆین بەشداری دەکات لە بە هێزکردنی شانەکانو گور بەخشین بە جەستەی مرۆڤ . . وەلیٚ هەندی پزیشك ئینکاری دەوری پرۆکایین دەکات ودەڵێن ئەگەر کاریگەری هەبێ بایەخێکی ئەوەندە گەورەی نی‌یە لە کۆتایشدا ناتوانرێ گرەو لەسەر ئەوە بکرێ کە مرۆڤ بەرەو پلەی کۆتایی ئەو ژیانە دیاری‌کراوەی دەبات کە وەك لە پێشدا وتمان سەدو دە ساڵە . .

ئەم شەش رێچکەیە بایەخێکی مەزنی هەیە لە نێوان پزیشکەکانی ولاٚتانی ئەوروپای رۆژئاوادا . . وەلیٚ رۆژهەلاٚتیش هەیە . . ئەو رۆژ هەلاٚتەی کە هەمیشە بەبێ دەنگیو دور لە رۆشنایی دەستکرد کار دەکات ، رۆژ هەلاٚتی چین ورۆژهەلاتی یەکیەتی سۆڤیەت ، پزیشکە فەرەنسی‌یەکان ئەوە دەسەڵمێنن کە چین لەم رووەوە گەلیٚ پێشکەوتووە بە تایبەتی بەرێ «دەرزی ئاژن کردن» ACUPONCTURE وەلیٚ ئەو هەوالاٚنەی لە چینەوە دیٚ رێ ئە وە نادات وینەیێکی پوختەی کۆتایی ئەم باسە بداتە دەستەوە رەنگە لە ساڵانی داهاتوو وسنگفراوانی وبەر بلاوەیی وقولی پەیوەندی چین لەگەڵ رۆژئاوادا زۆر شت لەم بارەیەوە ئاشکرا بکاتو یارمەتی پزیشکان بدات کە بتوانن وا بکەن مرۆڤ بەرگری لە پیریو لێکەوتن بکات کە لە سی ساڵیدا روو بە رووی تەمەنی دەبێت . .

**بانقی شانە لە سۆڤیەت :**

یەکیەتی سوڤیەت لەم رووەوە لە چەن لاییکەوە هەولٚو کۆششی هەیە ، ئەگەر چی ئەم هەوڵدانە پۆشراوە بە نهێنی وریا بوون کە چی هەنو دەڵێن : هەوڵیان تەرخانی شانەکان کردووە کە بەبناغەی گورو جۆش دەژمێردریت بۆیە پرۆژەی دۆزینەوەی ئەو رێکانەیان داناوە کە کار کاتە سەر شانە ماندووەکانو بەرەو گورو جۆشیان بەرێ وگەنجییەتی بگەرێنیتەوە . . پزیشکە ئەوروپی‌یە رۆژئاواییەکان باس لە هەولٚو کۆششی سۆڤیەتی‌یەکان دەکەنو دەڵێن یەکیەتی سۆڤیەت هەولٚی چاندنی شانە دەدات . . چاندنیٚ دەشیٚ پەنای بۆ ببرێ گەر ئاشکرا بوو شانەکان پەکیان کەوتووە لە بری ئەوانە دەخرێنەکار کە لە بانقدا دەپارێزرێ . ئەوانەی کە دەڵێن جەستە قایل نییە بە شتیٚ نامۆ ، سۆڤیەتیەکان بەر پەچی ئەم قسەیە دەدەنە ووو دەیسەلمێنن کە ئەم جۆرە سەرنجە نا دروستە ! سەرەرای ئەوەش هەولٚی ئەوە دەدەن لە لەشێکدا شانە لێکەنەوە ولە هەمان لەشیشدا بیپروێنن پاش چەند ساڵیٚ بەسەر ئەو شانە گەنجانەدا تیپەر بووبیٚ وتوشی ماندووبوون هاتبیٚ ، هەموو ئەم بەررەسی‌یانە لە پزیشکگایکدا وە ئەنجام دیٚ کە لە شاری کییفە و پایتەختی ئوکرانیا بەسەر پەرشتی پرۆفیسور مایکوسکی وە ئەنجام دیٚ ئەم هەموو رێچکانە لە دەرەوە بۆ دیوی ناوەوە دەبرێ بۆ ئەوەی بەرگری ناوەوە تەمەن درێژبێ تا شێوەی پرۆگرامی یاسای خۆراك–ی تایبەتی بە دەستکردیٚ دەژمێریو پەرژین دەهێنێە رێ وەلیٚ شێوازە پزیشکی‌یەکان هەندی سلٚ کردنەوەی پی‌دەویٚ ، مرۆڤ هەولٚی گور بەخشین بە جەستەی دەدات کەچی توشی درمێکی دی دێتو دەشێوێنیٚ راستە ئەو سلٚ‌کردنەوەیە کەمەو سنورداره چونکە پێشکەوتنی پزیشکیو پەرەسەندنی ئیحتیاتی پێویست ئەوەندە ترسناك نی‌یە . . وەلیٚ چاکترین ری‌یەك تەنها رێ‌ی ئاساییە . . دیٚ‌ی فیلکا بامبا لە چیاکانی ئالاندی ئەمریکای لاتینی جوانترین بەڵگەێیکە . . لەم دێ‌یەدا کە دەکەوێتە بەرزای ٢٤٠٠ مەتر تەمەن درێژنێکی زۆری تیا دەژیٚو تەمەنیان لە سەدەێیك زیاترە لە هاوینی رابووردودا پزیشکیٚ سەردانی ئەو دێ‌یەی کرد ومەگر پیاوێکی سەدو دوانزە ساڵەی بینی ، ئێوارەی پێش مردنی سواری ماینەکەی دەبیٚو جەولەیێك بە ناو کیلگەکاندا دەکات ، لە گەرانەوەی‌دا هەست بە ماندووبوون دەکات (ئیتر وەکو مۆمیٚ بیٚ زەبرو ئالۆزەی کوژایەوە) .

ئەم پزیشکە دەلیٚ ئەو زەلامانەی کە تەمەنیان گەیشتووەتە سەد ساڵاٚن بەشێوەێیکی ئاسای سێکس دەکەن . . هەندێکیان پاش سەد ساڵە منالیٚان بووە ، ئافرەتانیان بە پیتی خۆیان پاراستووە تا تەمەنی شەستو پینج ساڵە . . پزیشکەکە کە سەیری یاسای خۆراکیانی کرد بۆی دەرکەوت کە لەبەر هەژاری زۆر گۆشت ناخۆن ، بەڵکو بە شێوەێیکی بنەرەتی پەنا دەبەنە بەر مریشكو هێلکەو ئەو پروتینانەی کە لە نژادی نەباتی یەوەن .

دیٚ‌ی فیلکا بامبا چاکترین بەڵگەیە وئەوەی سەلماندووە کە سروشت باشترین شتە ، ئەوەی پەنای بۆ بەرێ دەگەرێتەوە پێویستی بە داو دەرمان نابیٚ کە گەنجایەتی بۆ بگێرێتەوە .

# قوتابخانەی روشدیەی مولکی وئەعدادی عەسکەری لە سلێمانی دا



## دوو دەستکەوتی ڕۆشنبیری گرنگی لە کاروانی کوردی دا

غفور مرزا کرم

هەرچەندە شاری سلێمانی لە مێژوودا ئەگەر لەگەڵ شارە دێرینەکانی تری کورد دا بەراوردبکرێ بەهاوچەرخو تەمەن کورتو نوێ دێتە پێش‌چاو ، بەڵام وەکی تر لەناوجەرگەی ناوچەیەك دا بناغەی دامەزراوە کە «شارەزووره» کە بەخێرو بێرترین ، پێشکەوتووترین ، شارستانیەتترین ، مێژووترین مەڵبەندی سەرتاپای کوردستان ئەژمێرێ ، کە بێ‌گومان ئەم هەلو مەرجە تایبەتیەو ئەم تانۆ پۆیە دەگمەناوەیە مۆرك‌و نیشانەی دیاری‌کراوی بەسەر سلێمانی‌و دانیشتوەکانی‌دا کێشاوە ، بەرەنگێ کە شقڵی دوێنی ، پەنجەی رابوردوو خۆی لەسەر زوربەی دیمەنو وێنەی‌و روخساری ئەمرۆدا ئەبینێ ، کوردوتەنی «گیا لەسەر بنجی خۆی ئەروێ» بۆیە جێگای خۆیەتی ئەگەر بڵێین کە سلێمانی ئەمرۆ میرات‌گری شارستانیەتی‌و گەنجینەی کەلەپووری نەتەوایەتی . . لانەی تیشك‌دانەوەی تێکرای بیری نوێ‌و پێشکەوتنی تازەی ناوچەکەیە .

شاری سلێمانی بەوێنەی کۆرپەیەکی نازداری دلێر لە ساڵی ١٧٨٤ دا لەباوەشی دایکی دڵسۆزی ئازای میرنشینی بەبە چاوی بەدنیا هەڵهێنا بەدەم‌گێژاوی کێشەو بەرەو تاڵو تفتی ژیانەوە کەوتە گاگۆڵکێ لەناو رۆژگاری خەمو پەژارەدا پێ‌ی‌گرت‌و قال‌بوو ، هەرەتی لاوێتی کردە قوربانی بۆ ئازادی‌و سەربەخۆیی ، بە ئارەق‌و خوێنی جگەر گوشەکانی قەڵای میرنشینی بەبەی دروست کرد . . هەمیشە خۆی‌کردبوە قەزاوەگێری کوردو دژی ڕوومو عەجەم ئەجەنگا .

پیتو فەری ئەم خاك‌و زەوی‌یە ئاووهەوای سازگاری ئەم نیشتمانە زۆر کەڵە پیاوو زاناو دانای پێگەیاندووەو تەخت‌و تاجی میرخاسی‌و دەستەڵاتداریی‌و پایەو پلەی بەرزی پێ‌ بەخشیون ، چەکی ئازایەتی‌و لەخۆبوردنێ داونی‌و هاویشتونیە کۆری خەبات بۆ بەرەوپێش‌کەوتن و سەرکەوتن . . . بەراستی لەم بوارە مێژوویی‌یەدا سلێمانی بێ‌ووچان لە پێناوی پێشخستنی کاروانی پێشکەوتن‌و شارستانیەت‌و ئاوەدان کردنەوەو پێگەیاندنی سوارچاکی ویژەو هونەر لەهەوڵ‌و کۆشش دابووە . . زیاد ووتن نیە ئەگەر بڵێین کە سلێمانی لەم پلەیەدا لەناو کـــەف‌وکوڵی وەجـــاخ‌ڕوونی ، بەخشندەیی‌و ، قوربانی دان بۆ پێشکەوتنی شارستانیەت‌دا بەهاری عومری ئەبردە سەر . . کۆشکی وتەلاری سەربەخۆیی‌و ئازادی بنیات ئەنا ،ناوی لەپاڵ ناوی بەبەدا بەوێنەی دوو ئەستێرەی جریوەدار لەئاسمانی شینی کوردا ئەدرەوشایەوە . .

ساڵی ١٨٤٧ پاش ئەوەی قەڵای ئومێدی کورد میرنشینی بەبە کەوتەبەر شالاوی ستەمو زۆرداری عوسمانیەکانو تەخت‌و بەختی دەستەڵاتداری رووخاو ناوچەکە بووبە دۆزەخ وئالای ئازادی تێدا پێچرایەوە ، خوزگەو ئاواتی پێ‌شێل‌کراو گورگی هاری ڕووم کەوتە لوورەلوور ، پەپوی کاول‌کردنو تالانو برۆ بە سەرلانەی دوانزە سوارەی مەریواندا دەستی‌کرد بە خوێندن پاش ئەم رووداوانە ناونیشانو جێگای شارستانیەت‌و ئاوەدانی تیایا کوێرکرایەوە . بەراستی ئەم بارە ناقوولایە بوو بەهۆی ئاوارەکردنی زۆر لە پیاوانی گەورەو شاعیرو زانایان هەرگیز ناچارکران کە شەربەتی دوور ولاتی‌و خەمو پەژارە بنۆشن‌و هەوارگەی دەربەدەری لەم‌لاو ئەولای دەوڵەتی عوسمانی‌دا هەڵدەن تا بەرەنگێکی تر ، بە شێوەیەکی تربکەونە خزمەت کردنی نیشتمان‌و پێشخستنی گەلەکەیان . شایانی باسە ئەوانەی چەرخی چەپ‌گەردی کردبونیە میوانی ئەستەنبول کە لەوسەردەمەدا ئەم شارە بەکانگای شارستانیەت‌و سەرچاوەی بیرکردنەوەی نوێ ئەژمێردا لە دوولاوە دڵو مێشکیان ئەهەژێنراو ، لەلایەکەوە بیروڕای شۆڕشی فەرەنسە کاری تێ‌ئەکردن لەلایەکی تریشەوە کلۆولی ژێردەستەیی گەلەکەیان رای‌ئەچڵەکاندن بەمانایەکی‌تر ئەمانە هەر بە جەستە لە ئەستەنبول‌بوون ، دڵ‌و گیانیان لەگەڵ پەژارەو داماوی کۆمەڵانی خەڵکی ولاتەکەیان‌دا بوو چاوویان هەربەگردی سەیوان‌و دەشتی کانیسکان ئەکرایەوە ، خەیاڵیان هەر لەسەر ئاوی ئەزمرو سەرچناربوو بەو بایە ئەژیان کە لەوێوە ئەهات ، ئاواتەخوازو چاونواری فەرمانێك بوون کە رۆڵەکانی نیشتمان پێیان‌بسپێرن .

هەر ئەم هویەبوو کە ئەحمەدپاشای دوا پاشای بەبە کە هاتە ئەستەنبول لەگەڵ سلێمان بەگی غواس کەرۆڵەی یەکێك لەبنەماڵەکانی سلێمانی بوو دوو قوڵی بوونە دەم‌ڕاست‌و نوێنەری ڕاستەقینەو زبانی حاڵی دانیشتوانی ناوچەکە . . هەر دوو لەگەڵ بەشدارکردنی گەلێ لە پیاو ماقولانی

تر ئەوانەی کە بە تواناى مێشك ، یا بەهێزی بازوویان پایەو پلەی گەورەیان لەهەندێ دامو دەزگای گرنگی دەوڵەتی عوسمانی‌دا دەستگیربووبوو کەوتنە چالاکی نواندن بۆ جێ‌بەجێ کردنی داواو داخوازی کۆمەلانی خەڵك کە لە ئاکامدا سەرکەوتنێکی گەورەیان لە ئاسۆی بەرزی شارستانیەت‌دا هێنایە بەرهەم ، ئەوەبوو بەکردەو کۆششی ئەمان بە پشتیوانی‌و




پشت‌گرتنی خەڵکی لە سلێمانی‌دا بریاری دانانی قوتابخانەیەکی روشدیەی مولکی‌یان لە دەوڵەتی عوسمانی وەرگرت .

بەم چەشنە لە ساڵی ١٢٨٥ کۆچی ، ١٨٦٨ زایینی ئەم قوتابخانەیە بەچوار پۆلی کرایەوە لە سلێمانی ، قوتابیان چوار ساڵ لە سلێمانی‌و ، دوو ساڵ لە ئەعدادی بەغدا ، دوایی دوو ساڵ لە ئەعدادی ئەستەنبول ئەیانخوێند ، ئەوسا دەرئەچوون‌و باوەر نامەیان وەرئەگرت وئەبوونە ئەفسەری سوارە ، پیادە ، تۆپچی ، بەیتاڵی . . هتد .

بەراستی کردنەوەی ئەم قوتابخانەیە لەو رۆژە رەشە تاریکە شەوەدا وەلەو بارە ناقۆلایەدا بەسەرکەوتنێکی گرنگ ، بە شوێنەوارێکی دیاری‌کراوی شارستانیەت ئەژمێرێ ، هەروەکو بە پێواندنی پلەی زانستی ئەمرۆ هاوتای زانکۆیەکی ئێستایە ، وەلەریزی پایەیەکی بەرزی خوێندەواری دێتە بەرچاو . ئەوەی پێویستە بووترێ کردنەوەی ئەم قوتابخانەیە بەتەنها نابێت بخرێتە سەر کردەو کوششی یا پاڵ پەیوەندی‌یەکی شەخصی نێوان ئەحمەد پاشاو سلێمان بەگ لەگەڵ سوڵتانەکانی عوسمانی‌دا وبەس .

دیارە باری ستراتیژی‌و گرنگی ناوچەکە کە خۆی بەنیسبەت عوسمانیەوە بایەخێکی تایبەتی هەبووە جگەلەمە ووتووکایی دانیشتوەکانی‌و هاوارکردنیان بۆ دابین‌کردنی داخوازیەکان ، تواناو لێ‌هاتوویی جەنگاوەریان لە مەیدانی شەردا ئەمانە بەگشتی هەوین‌و هووی بنەرەتی بوون چ لە ئاوردانەوەو بەدەنگەوە چوونی سوڵتانەکان لێیان‌و جێ‌بەجێ‌کردنی داواو داخوازیان . . یاخود بەهاوار بردن یارمەتی وەرگرتن لێیان لەکاتی تەنگانەو رۆژی ناخۆشیا . بۆ نموونە هەرجارێ دەوڵەتی عوسمانی ئەکەوتە ناو تەنگ‌و چەڵەمەی ناوخۆیی‌یەوەو تووشی کێشەی شەرو هەرای دەرەوە ئەبوو لەگەڵ دەوڵەتەکانی تردا ، یەکێ لەو ناوچانەی کە پەنای بۆ ئەبرد هاواری یارمەتی لێ‌ئەکرد ناوچەی شارەزوور «سلێمانی» بوو .

شەری نێوانی روسیاو تورکیای ساڵی

١٨٧٧- ١٨٧٨ ئەتوانین بیکەین بە باشترین نموونە بۆ ڕاستی ئەم قسەیەمان ، ئەم شەڕەداو وەکو لە زۆر مەیدانی تردا ڕوویدابوو سوڵتانەکان بەکارامایی ئازایەتی‌و دڵسۆزی‌و میرخاسی کوردیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکار هێناوە ، کاتێ سوڵتان داوای یارمەتی لە کوردەکان کردوە بانگەوازی شەڕ دەرچوو تێکرا کوردی ئەم ناوچەیە بەپیر دەنگی کاکە ئەحمەدی شێخەوە چوون لەسەر فەرمایشی پیرۆزی هەرچی دەستی تفەنگی بگرتایە هاتە ژێر دروشمی «لا اله الا الله غەزا ئەکەین ئەنشاالله» یەوە ، بەم چەشنە نیمچە لەشکرێك ڕێکخرا نیوەی خەڵکی سلێمانی لەژێر سەرکردایەتی شیخ سەعیددا ڕووەو کوری مەیدانی شەڕ کەوتنە ڕێ ، کە لەئەنجامدا زوربەیان لەژێر بەفرو سەرماو سۆڵەی قەفقاسدا بەنائومێدی دوور لە نیشتمان سەریان نایەوە . گرانیە گەورەکەش کە هەموو جارێ باو باپیرمان چیرۆکە تاڵو تفتەکانیان بۆ ئەگێڕانەوە هەر لە ئاکامی ئەم شەڕەدا کەوتەوە ، ئەمە مشتێکە لە خەرواری . . هەزارەها وێنەی تر کە دەوری باڵای ناوچەکەو دانیشتووەکانی ئەنوێنی لەسەر گۆران تو . هەڵس‌وکەوت‌و بارو دۆخی دەوڵەتی‌عوسمانی‌و دامودەزگای ، بۆیە پێویستە بەم سەنگ‌و بەردە پەیوەندی نێوان سولتانەکان‌و گەورە پیاوەکانی کورد بکێشین ، وەلە سەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستیە . بۆ لێکۆڵینەوەو شی‌کردنەوەی ڕووداوەکانی ئەو چەرخە بچین .

لە ساڵی ١٣١١ ك‌دا بەکردەو کۆششی خەستی سەرۆکی شوورای دەوڵەت سەعید پاشای خەندان قوتابخانەیەکی تر بەناوی ڕوشدیەی عەسکەری لە سلێمانی بە چوار پۆل کرایەوە قوتابیان پاش چوار ساڵ خوێندن دەچوونە بەغدا لەوێش (٣) سێ ساڵ دەیانخوێند ئەوسا ئەبوونە ئەفسەری سوارە ، پیادە ، تۆپچی . . . پاش ئەمەش هەقیان هەبوو بچنە ئەستەنبول کە لەپاش (٣) سێ ساڵ خوێندن بەپلەو پایەی بەرز دەرئەچوون وجێگاو شوێنی گرنگ‌و تایبەتی خۆیان لە دامودەزگای عوسمانی‌دا ئەکردەوە ، بێ‌گومان کردنەوەی ئەم قوتابخانەیەش بەدەستکەوت‌و سەرکەوتنێکی گەورەتر ئەژمێررێ . . پیرەمێرد زۆر بەشانو باهووی ئەم سەعید پاشایەدا هەڵئەداو دەربارەی دانایی‌و نیشتمان پەروەری ئەدوێ وەدەڵێت :- « دیارە خاکەکەمان زۆر بەپیت‌و بەرەکەتە کە پیاوی واگەورەو هەڵکەوتوو پێ‌ئەگەیەنێ . . ئەم سەعید پاشایە کەلێرە بوو (سلێمانی) بە دوای کاروانەوە چووە ئەستەنبول ، لەوێ گەورەبوو ، واگەورەبوو تەنانەت قەیسەری ئەڵمانیا لەدوایەوە ئەڕۆیی» .

وێنەی سەرگوزەشتەی ژیانی سەعید پاشای خەندان ئەو ڕاستیەمان بۆ دووپات ئەکاتەوە کە کەڵە پیاوانی کورد بە شانو بازوو توانی مێشك‌و قەڵەمیان پایەو پلەی بەرزیان لەدەزگای دەوڵەتی عوسمانی دا وەرگرتووە تەنانەت ئەو قوتابخانە تایبەتی‌یەی کە سوڵتان لەژێر ناوی «قوتابخانەی تایبەتی بۆ کورانی عەشائیر سەرۆکەکان لە ئەستەنبول کردبوویەوە ، کە کورانی عەشائری ناو دەوڵەتی عوسمانی وپیاوە ماقووڵانی وولات تیایانا ئەخوێندوە دەرئەچوون‌و ئەبوونە فەرماندەی لەشکر . نوێنەر لە ئەنجومەنی مەبعوثاندا مەگەر بەدەگمەن نەبێ ئەگینا کوردی لێ بێ‌بەش کرابوو .

لە ساڵی ١٣٢٥ ك‌دا پیاوماقوڵانی کوردو کۆمەڵانی خەڵکی سلیمانی جارێکی تر بە هەوڵ‌و کۆششی خۆیان توانیان قوتابخانەیەکی ئەعدادی موڵکی لە سلێمانی دامەزرێنن ، شایانی باسە ئەم قوتابخانەیە لە ڕوشدیەی عەسکەری باڵاترو گرنگ‌تر بوو ئەو بابەتانەی کە لەقوتابخانەکانی بەغدادا ئەخوێنرا لێرەش‌دا ئەخوێنرا وە دەرچوانیش لە گشت قوتابخانە بەرزەکانی بەغدا وەرئەگیران ، وە بەباوەڕنامەی ئەم قوتابخانەیە دەرچووان ئەیانتوانی ببنە فەرمانبەر وەپلەی بەرز لە دەوڵەت‌دا بگرنە دەست . . لە سایەی ئەم قوتابخانانەوە زۆر لە کوردەکان جێگای بەرزیان لە دەوڵەت دا وەرئەگرت ، جگە لەمەش بوونی ئەم قوتابخانانە گەشەکردن‌و چالاکی نواندنی بەباڵای جولانەوەی ڕۆشنبیری کوردا بری ئەوەبوو دەرچوانی ئەم قوتابخانانە دەستێکی باڵاو دەورێکی مەزنیان لە بوژاندنەوەو خۆش‌کردنی جولانەوەی نیشتمانی کوردی پاش سەفەربەر داگیرا .

شیاوی باسە قوتابخانەی ئەعدادی موڵکی‌و ڕوشدیەی عەسکەری تەنها یەکی حەوت مامۆستا تیایا دەرسیان ئەوتەوە ، هەرچەندە ئەعدادی مولکی ژمارەی قوتابیانی (٧٠) کەس‌و ڕوشدیەی عەسکەری (١١٠) قوتابی هەبوو .

**سەرچاوەکان**

زوربەی سەرچاوەکانی ئەم باسە لە ڕۆژنامەکانی ژیان‌و ژین‌وە گۆڤاری زاری کرمانجی‌م وەرگرتووە بۆ وینە :-

١ بروانە گۆڤاری زاری کرمانجی ساڵی پێنجەم ژمارەی (٢٢) ٣٠ نیسان ١٩٣٠ .

٢ - بروانە ڕۆژنامەی ژین ژمارەی ١٢٤٧ ساڵی ١٩٧٥ .

٣ - براوانە ڕۆژنامەی ژین ژمارەی ٧٣٥ ساڵی ١٩٤٤ .

# ڕاست بێژی لە هونەردا

ئازاد عبدالواحد کردوویە بە کوردی

هونەر گەڕانە بەشوێن دۆزینەوەو دەربڕینی ڕاستیەکاندا . . هونەریش دووچاری پووکانەوەو لەکارکەوتن دێت هەر کاتێ هونەرمەندەکە ماندوو شەکەت بێ‌و شەنگی ئەوەی لەبەرا نەبێ بگەڕێت بۆ ئەو ڕاستیانەو هەر ئەو کاتەش دەبڕینەکەی ئەبێ بە کارێکی ڕووکەشانەو بەرەو لایەکا لار ئەبێتەوەو سەنگەلا ئەبێ . . لەو لا هەزاران ڕاستی ڕەنگاورەنگ دەربارەی هەر بابەتێکی بێگریت هەیە ، بەڵام ئەرکی ئەستۆی هونەرمەند گرتنی بڕبڕەی پشتی ڕاستیە زەقەکەیە بەگوێرەی ئەو بابەتە تایبەتیەی دەیەوێ هەڵی بژێریت . . ئەتوانێ یەکێك بێت بە پەراوێك باسی خوانێکی ئاسایی بکات‌و بیکاتە بابەت‌و پێوەرو جۆری دارەکەو دروست‌کردنی و کێ دروستی کردووەو لە چ کاتێك‌داو هەق دەستی چەند بووەو کێ بەکاری‌دەهێنێ‌و کەڵکی چی‌یە . . لەوانەیە پیاو لێرەدا پێویستی بەو زانیاری‌یە هەبێ کە زانایەکی ماتماتیك‌و جوگرافیا یان مێژوو نووسێکی کۆمەلایەتی یان زانایەکی ئابووری – سیاسی ، تا بتوانێ هەموو ڕواڵەتی ئەو ڕاستیانەی پەیوەندیان بە خوانەکەوە هەیە دەربڕێ . . بەڵام ڕاستی‌یە هونەری‌یەکە تەواو لەگەڵ ئەوانە جیاوازی هەیە . . ئەبینین (بیکاسۆ) خوان بەکاردەهێنێ بۆ جێ‌گیرکردنی یەکێك لە پەندەکانی . (دیکنز) یش بەکاری‌دەهێنێ وەك هۆیەك بۆ ناڵین لەو داوەتەی کە لە چیرۆکەکەی (گۆرانی لەدایك‌بوون)دا ئەبیندرێ . ڕاستیە بنچینەیی‌یەکە لەبارەی ئەو خوانە دیاری‌کراوە ، لەو چرکەیەی کە هەوڵ‌دەدەم پەراوەکە لەسەر خوانەکەدا بنووسم . . بەڵام هونەرمەند ئەبێ شێوە جۆربەجۆرەکانی ڕاستی بزانێ بەر لەوەی دەست بکات بە هەڵبژاردنی . . پێویستە نووسەر هەموو شتێك بزانێ . یان بەلایەنی کەمەوە زیاتر لەوەی دەتوانێ بیکات . . گۆرکی دەڵێ : «پێویستە ئەو تواناو زاڵ‌بوونەی هەبێ بتوانێ ئاژاوە سەرپێی‌یەکان لە بەیەکاچوونی عاتیفەو ئەو شتانەی گرینگیەکی نموونەیی‌و گشتی هەیە جیابکاتەوە . . ئنجا لە هەموو مەسەلە تەسك‌و تروسك‌و کەسێتی‌و خودی‌و سەرپێی‌یەکان دووربکەوێتەوە ، کە لە باری جوڵانەوەیەکی بەردەوام دایەو بزرئەبێ ئەوەی لەدوای خۆی شوێن پێ‌یەك جێ‌بهێڵێ . . هەرکاتێ توانی بەشی یەکەم زامن بکات ، کارەکەی ئەبێ بە کارێکی هونەری‌و گرینیگیەکی کۆمەلایەتی ئەبێ ، بەڵام ئەگەر بێزار بوو لە هێنانەدی بەشی دووەم ، ئەو کاتە چەند چیرۆکێك ئەنووسێ کە بنەما کۆمەڵایەتی‌و فیرکاریەکان وون ئەکات . .» گۆرکی باسی ئەوە دەکات کە تاکە کەسێك چۆن توانی (فورمارگوردایف) دروست بکات : « پێویست بوو لە دەیان کوڕە بازرگان بکۆڵمەوە کە نە بە ژیانی باوك‌و نە بە پیشەکانیان ڕازی نین» ، هەر لەو ڕێگایەوە نووسەر ئەتوانێ تایبەتیەکی زیندوو هەڵ‌بژێری کە کەسایەتیەکە دەکات بە شتێکی (ڕاست) .

لەو لا ملیۆنەها ڕاستی دەربارەی کۆمەڵی سەرمایەداری هەیە ، بەڵام لە هەموو ڕاستیەکان زیندووتر ململانێی چینایەتیە بەو سیفەتەی سەرچاوەی جموجۆڵیەتی‌و تەنیا لەسەر بنچینەی ئەو ڕاستیە دۆزراوەیە توانرا ڕاستیەکە بکێشرێ دەربارەی کۆمەڵی سەرمایەداری . . .

هونەرمەند هەرچەند بلیمەت بێ ، ئەوەندە ڕوانینی قووڵ‌ئەبێ . . شەکسپیرو تۆلستۆی ئەو شتانەمان بۆ ئەدۆزنەوە زیاتر لەوەی نووسەرێکی هاوچەرخ دەیڵێ : «ژیان ئەوهایە نازانم بۆ؟ .» مشت‌ومڕو مقۆیەکی زۆر کرا دەربارەی بایەخی نووسەری بلیمەت بۆ ڕاستگۆیی‌و دیاردەی کۆن‌و کەلەبەرەکانی ناوەوەی . . دەبینین (بەلزاك) لە ڕۆمانەکانی ڕووخان‌و وێرانەیی خەڵك جێ‌گیردەکات کە دەیویست بۆیان بکێشێ . . (هاردی)یش بەزەیی پیا هاتنەوەی بەسەر جووتیارەکانی (ویسکس)دا زاڵ‌بوو بەسەر بیرە فەلسەفیەکانی‌دا . . (تۆلستۆ)یش لەگەڵ باوەڕە سەلبیەکەی دەربارەی بەرگری‌کردن لە ڕۆمانەکەی (البعث) کۆتایی‌یەکی دایە کەس بیری بۆ نەئەچوو . . هەندێ جار بیروڕایەکانی هونەرمەندی ووشیارو بەئەگا لەگەڵ یەکگرتنە هونەریەکەی ڕووبەڕووی یەکا

ئەوەستن ، بۆیە ژیری نابێ زیاد ـ پێویست بایەخی پێ بدرێ بۆ قەرزبارکردنی هەڵوێستی –تۆلستۆی– چونکە (مەسیحی) بووەو (شیللی)یش بەلاوە بنێین چونکە لە سیاسەتدا رادیکالی بووە ، پێویستە ئێمە لە پێودانگی بەرهەمەکانیاندا بڕیاریان لەسەر دەربکەین . .

ئەوەی لە تۆلستۆی دەبیندرێ زێترە لە هی (شیللی) چونکە ئەو ناوەڕۆکی (ناوەوەی) هەرچی بێ ، خۆ توانیویەتی تێگەیشتنێکی قووڵ بدۆزێتەوە بۆ باری کۆمەڵی مرۆڤایەتیو بۆ دڵی مرۆڤ . . سروشتی هونەر ناگۆڕێ هەرچەندە شێوەو ئەرکەکانی بگۆڕێت ، هەر بۆیەشە لەو لا جوداوازیەکی جەوهەری نیە لەنێوان (بتهۆفن) و(شۆستاکۆفیش)و لەنێوان (دیکنز)و (گۆرکی)دا .

هونەرە نەمرەکان وەك (جورج لۆکاتش) ئەڵێ : «وێنە کێشانی ووردی مرۆڤە بە شێوەیەکی تێکرای لەسەر جەمی کۆمەڵ» کارە هونەریەکە لە پلەی نزمەوە وێنەی بەشێك لە مرۆڤ دەکێشێ لە بەشێك لە کۆمەڵ ، کاتێ کە باسی ریالیزمی دەکەین مەبەستمان لەوە خۆ بەستنەوەیە بە (راستگۆیی) لە ئەدەبدا . . ئەو دەمە تەقێ زیندووەی کە چرپەی ژیان ئەداتە کارەکانو چاوەدێری بارەکانی کۆمەڵو ناهەموارییە دژوارەکان دەکاتو راستیە ووردو ماددیەکان دەخاتە بەر دڵو دیدە . هەموو ئەمانە لەبەر چاوی هێنانەدی ئەو خۆبەستنەوەیە بە راستگۆیی هەرچەند ئەمانە هەموو هۆیەکان نین بیرینەوە . .

ئەو چیرۆکە ئەفسانەییانەی کە پڕو لێوریژە لە ئاژەڵی سەیر سەیرو سیحربازو دێوو حوجی بەنی حەللاق جۆرە راستگۆیەکی تایبەتی تیایە . . چیرۆکی (رۆمیوو جولێت) لەو گومانو دوو دڵییە دووره ، بەلام ئەوە نابێتە هۆی نەژماردنی بەکارێکی واقیعیانە . . ئەو هاتووە باسی راستی دەکات دەربارەی کارەساتی دور خۆشەویست لە جیهانێك کە خۆی لە خۆیدا بووە بە دوو بەش . . تەوسو لاقرتێ هەروەك لە (گەشتەکانی کالیفر)دا ئەبیندرێو فەنتازیاو رەمز ئەمانە هۆن بۆ دۆزینەوەو پشکنینی کونو کەلەبەرەکانی واقیع ، بەکاربردنی شێوازێکی ریالیزمیانە بەڵگەی گەیشتن نیە بە سەرچاوەی ریالیزم . .

بێگومان دەربڕینی (واقیع)و (مرۆڤایەتی) بەری زۆر لێکدانەوە هەڵدەگرێو لقو پۆپی زۆری لێ دەبێتەوە . . (هۆمیرۆس)و(شۆلۆخۆف) و (براکلیتیلس) و (بیکاسۆ)و (باخ)و (بتهۆفن) هەر خۆیان لەگەڵ مرۆڤایەتین ، واتە لەگەڵ ژیانو پێشکەوتنی مرۆڤدان . کە دەشێلین ریالیزمین ، واتە زۆر جۆر لە راستییەکانی گەردوونو کۆمەڵو پەیوەندییەکانی ئادەمیزادو سروشتی پێكهاتنی خەڵك ئەدۆزنەوەو ئەخەنە روو . .

بیروبـاوەڕو تیـۆرو رێگا دیالکتیکییەکان دەرهەقو بە دژایەتی لە زۆرانبازی بەردەوام چارەی بۆ ئەدۆزرێتەوەو مل ملانێو دووبەرەکی نوێ دروستئەبێ . . ئەو بیروباوەڕە هەر تەنیا خزمەتی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ناکات ، بگرە لێکۆڵینەوەی زانستو سروشتو هەموو دیاردەکانی تریش لەگەڵ جموجۆڵەکانی مرۆڤایەتی . . بۆیە ئەو هونەرمەندەی کە لەسەر ئەو تیۆرە ئەروات ، پێویستە هەر لە سەرەتاوە ئەو دەستپێشکەریەی هەبێو بڕواش ناکەم بەرێکەوت زانایانی سۆڤیت لە پلەی یەکەم بووین لە پێشبڕکێی – ئەسبۆتنیك– بیکاسوو ماك دیارمیدو برێشت ، هاوچەرخەکانی خۆیان جێهێشتو سەر ئەوان کەوتن . . بەلام هونەرمەندە بلیمەتەکان ژمارەیان کەمەو ماوەیەکی درێژ ئەخایەنێ لەنێوان سەرهەڵدانی یەکیانو ئەوەی تریان . . ئەوەی وەکو شتێکی بایەخدار لەبەر چاوی دەگرین ، ئەو ژمارە کەمە هونەرمەندەیە ، ئەوانەیش کە بەهۆی تەسکی ئاسۆی چینایەتیو سێکسو بەهۆی لادانو لاربوونەوەی سیاسیو فەلسەفی دەروانن جیهان لە پەنجەرەیەکی تەسکەوە باسی قووڵی ئەو عاتیفەو شتانە دەکەن کە تەنگ بە ئەندێشە هەڵدەچنێ تا رادەیەکی زۆر ئەوانە ئەو کەسانەن کە (لوێس ماکێنس) لە (ماتەمینی بۆ شاعیرە بچکۆلەکان) باسیان لێوە دەکات :

ئەوانەی ئاگریان دائەگیرساند ، ئەگەر پریشکە ئاگرێك رووی دابایەت ئەوانەی هەموو ووشەکانیان زانی ، بەلام لە هێنانەدی «ووشە»دا مایە پووچبوون بلیمەتی لە جیهانێکی سەیرەوە سەرهەڵدەدات ، کە هەرگیز بەخەیالا رانابورێ . . کێ لەو بڕوایەدا بوو نیوەی نەخوێندەوارەکان بێن بە نیوە کوێرو لە گەرەکێکی نابووتی (دبلن) بگیرسێنەوە . کێ بیری لەوە دەکردەوە (شوون ئۆکاسی بێ بە خاوەنی (بوندو بەخشینی پایەکان )–یان کێ بیری بۆ ئەوە دەچوو رۆمانی (شەرو ئاشتی) خاوەنی زەویەکی دەوڵەمەندو ئورستقراتی بینوسی– بەشێکی گەورەو هەرەزۆری هونەرمەندە بچووکەکان . لە ئەنجامی «پێك هاتنی کۆمەڵ»دا سەر دەرکەنو دەتوانن برە

کارێکی کەمو بێ‌هێزی تێ‌بکەن . . بەلاَم لە کۆمەڵێکی تردا بە جموجوڵێکی زیندووەوەو لە قەناعەتێکی راستگۆیانەوە سەیری پێش خۆیانو دووا رۆژەکەیان ئەکەن . . بەلاَم لە کۆمەڵێکی نەخۆش‌و پەککەوتە شپرزە بوو ، خۆیان بۆ جڵەوی عاتیفە شل‌ئەکەنو ، شەنگی ئەو راوە دوو نانەیان لەبەردا نیە . . ئێمە لە بەریتانیا لە کۆمەڵێکی نەخۆشا ئەژین . . چونکە سەرمایەداری وێنەو روخساری مرۆڤی شێواندووە ، بۆ بایەخ‌دان‌بە لایەنی هەڵپەرستی‌و ملکایەتی‌و شتی تری پروپووچ . . هەر لێرەوە ئەوانەی میسالیانە ئەروانن ، ئەبن بە جێگای تەوس‌و لاقرتێ پێ‌کردن . و خاوەن هەستە پاك‌و نازکەکانیش ئەبن بە مەسخەرەو ئەکەونە ژێر باری روانینێکی درندانەو هەڵەپاسانە . .

لە سەراپای ژیانی ئێمەدا زۆربەی دیاردەو بنەما ساختەکارەکان پاداشت ئەکرێ‌و رەپێش ئەخرێن . . هەر لە رژێمی فێرکاری‌یەوە تا بەدارستانی دابەرە خاوەن سامانە بەرزەکان ئەگات . . لەو کاتەی کۆمپانیای ( کلۆرو مۆتونو کۆرتلاند)و (ئای ، سی ، ئای) بە کە لێپەکانیان گاز لەیەکتر ئەگرن ، دوای ئەوەی دەستەو دایەرە بچووکەکانیان وەکو حەزیا هەڵ لوشێ . . ئەو ئایدیۆلۆژیایەی لە کۆمەڵی ئێمەدا تاوئەدرێ‌و باوی هەیە ، ئایدیۆلۆژیای چینی دەسەلاَت‌دارە ، لەگەڵ ئەوەی بزوتنەوەو جموجوڵی کرێکاران سیفەتی قوربانی‌دانو خۆبەخت کردن بە بەرژەوەندی کەسێتی ئەدرێ‌و لە هەمان کات‌دا هاوکاری‌کردنو ئازایەتی دێتە گۆر ، بەلاَم ئەوانەش نیهاد پیس‌و خەراپە کاری بە بیروباوەری سۆشیالیستی هەیە ، بیروباوەرەکەیان بەلاوە ئەنێن ، بەرامبەر بە وەرگرتنی پایەیەکی بەرز لەو کاتەی پێنج هەزار جونەیە لە ساڵێکا وەرئەگرنو کورسیەکیش لە ئەنجومەنی (لوردەکان) زەفت ئەکەن . . . بەشێکی هەرە زۆری ئەو کارە هونەریانەی لەژێر سایەی کۆمەڵێکی واوە دێتە بەرهەم . زیاتر بەتەنگ دەربرینی ئەو مەسەلانەوە ئەبێ ، زیاتر لەوەی قیەمی تر دروست بکات . . . هونەرمەندە رەسەنەکانیش حەیرانو سەراسیمە ئەکەن تا دەست لە راستیەکان هەڵگرێ ، چونکە ، دەرخستنی ئەو راستیانە مایەی ریسوابوونو شار بەدەری ئەوانە . . هەروەك (ئارثەر میللەر) گۆتەنی (زوری کردنو لە قفە نانی روانینەکان) . (ئەرستۆ) ئەڵێ : ئادەمیزاد گیانداریکی کۆمەلاَیەتی‌یە ، پێویستە لەگەڵ مرۆڤانی تردا بژیت‌و پشتی پێ‌یانەوە ئەستوور بێ رادەی بەختەوەریشی ئەوەستێتە سەر هێنانەدی‌ی ئەو تەرازوو راگرتنە لەمیان تاکە کەس‌و ئیلتزامە کۆمەلاَیەتیەکان . . ئەوە راستیەکە سێ‌و دووی لەگەڵ ناکرێ . . بەلاَم زۆربەی نووسەرە هاوچەرخەکان نابینان بەرامبەر بەو راستیە ، بەدەستی ئەنقەست هەول‌ئەدەن لەجیاتی ئەو کارە گۆشە گیریەکی خودی ئادەمیزادو ئەو جیهانەی تیایا ئەژی دروست‌بکات ئەو کاتەشە کارەکان وێنەی راستەقینەی مرۆڤ ئەکێشن ، وەکوو کەسێکی تەنیاو گۆشەگیرو دوور لە کۆمەڵ ، واتە دوور لە سیفاتی کۆمەلاَیەتی ، کە وونکردنی ئەخلاق‌و تواناو ئەو کارانەیە کە لەگەڵ خەڵکی تردا پەیوەندیەکی زیندوویان هەیە ئەوساش لەنێوتاق‌کردنەوە تایبەتی‌و خودیەکانی خۆیا ئەخنکێ‌و ناشتوانێ پەیوەندی لەگەڵ کەسانی تردا ببەستێ . .

**تاکوئێرە**

لە رۆمانی- نامۆ-ی (ئەلبیر کامو)دا . . کەسە سەرەکیەکە هەموو ژیانی بەرێ‌دەکات ، وەك بلێ‌ی بۆ یەکێکی تر ئەژی‌و ژیان ئەباتە سەر ، کەسەکانی (پیکێت) بەند بەندئەکرین لە سنوف‌وتا قورگیان لە لما نقووم ئەکرین . . بێزارن ، بێزاریەکی تەواو هەتا لە بەشداری ژیانی خۆیاندا ، مرۆڤیش دەبینن . . بەبێ ئارەزوو دەسەلاَتی خۆی پالی‌پێوەئەنێ بۆ عاتیفەیەکی سەیرو سەمەرە ، وەکو لە (لولیتا)ی نابوکۆف دا ئەبیندرێ . . (جان جینێه)ش لە (دەلاقەکەی)دا وێنەی جیهان وەکو گۆیەکی گەورە ئەکێشێ . کە خەڵك خەم‌و گۆشەگیریەکانی تیا ئەبینی‌و ئەچێژێ . . لەو کاتەی واقیعی دەرەوە ئەبێتە شتێکی بێ ماناو ناوەرۆك ، بەکاری سەرۆکە شۆرشگێرەکەو سەرۆکی پۆیسی فاشستەکان کە رەوتی خۆیان ئالۆگۆرکرد . . (گراهام گرنیش) بێ‌سوودی‌و بێ‌گاری ئەوە دەردەخات کە یەکێك چاکە بۆ یەکێکی تر بکات . . ئەو کارە چەند بە چاك تێ‌دەگات ئەوەندە ئەنجامەکەی بە خراپ دەزانێ . . لە چیرۆکی (بنچینەی مەسەلەکە)دا ، (فاسکۆبی) بەرێوەبەری پۆلیس ، بە میهرو سۆزەوە کە لە نیازێکی پاکەوە دەردەچی‌و دەبێتە هۆی شەرو کوشتارو خۆکوشتن لەئەنجامی ئەوەوە ، سەرگەردانیە کوت‌و پری‌یەکەی ئافرەتەکەو خۆشەویستی‌یە لەرزۆکەکەی بە (مەسیح) لە چیرۆکی (کۆتایی مەسەلەکە)دا وای بۆ دەردەکەوێ کە لە هەموو کۆت‌و زنجیری لێ‌پرساوی بەرامبەر مرۆڤەکانی تر رزگاری ئەبێ . .

لەولا ژمارەیەکی بێ کۆتایی لە

بەرهەمی ئەدەبی لە پلەیەکی نزمدا ئەبینریّ کە (سێکس) پێویست دەکات لەسەر خۆشەویستیو زەبروزەنگو هۆیەکانی بیّ ئاگاکردن– مخدرات–و تاوانکردن ، لەگەلّ شیتلّکردنی کەسێتیو رووخانو ویّرانکردنی پەیوەندییە مرۆڤایەتیەکەی مرۆڤ لەنیّوان ئەو گۆشە گیرەی کە شایانی بەزەیی پیا هاتنەوە بیّ ، لەئەنجامی وونبوون لە نیّو ئاژاوەیەکی زۆردا . . دەتوانین بلیّین زەبرو زەنگ– عنف– و سێکسو تاوان کردن هەردەم مادەیەکی بەپیّزی هوتەر بووە لە ئنجیلو شەکسبیرو ئیبسنو دوستۆفیسکیدا ، هەروەك چۆن بەشیّك بووە لەژیان . . چاو خشاندنیّکیش بە رۆژنامەدا ئەوە دەسەلمیّنیّ . کە بەریتانیای ئەمرۆ ، زیاتر لە پیویست پیّشوازی ئەوکارە دەکاتو تا خەلّکە ژیرەکەش چیّژ لەو زەبروزەنگە توندو قیزەو لە رووداوی کوشتارکاریو تاوانکردن وەردەگرن . . هەموو یەکیّك لە ئیّمە لە ناخەوەیدا ئەو غەریزەی ویّرانکاریە ، رەشەمان تیایە ، ئەگەر بەسەریشیا زالّبین ، ئەوە بوونی بەندەییەکەیە لەلامان . « هەر یەکیّك لە ئیّمە حەزدەکات باوکی بکوژیّ» ئیڤان کارامازۆف لە دادگادا پر بە دەنگەکەی هاواردەکات «ئەگینا ئیّوە بۆ لیّرەن؟» ، بەلاّم ئەو تاوانکردنەو بوونی ئەو توندو تیژییە وەك بەشیّك لە ژیانو دووبەرەکیّیە رەشەکەوەکو بەشیّك لە سروشتی ئادەمیزادەکە هەیە . . ئەوەی گەورە نووسەران دەیکەن ، کاریّکی زۆر جیاوازە لە خستنە رووی بەویّنەیەکی گۆشە گیرانەو دوور لە ریّرەوی ژیانی بنچینەییو میّژووی ، ئەوانە بەشیّکی زور بچووك لە راستی ئەخەنە روو ، تا ئەگەنە ئەو سنوورەی لە بازنەی درۆیەکی راستگۆیانە دەرئەچیّ . . سەرەرای ئەوەش پیّش‌کەش کردنی بەشیّك پەیوەندەی کە دوور بیّ لە تیّکراو سەرجەمی خەلّك ، هونەریّکی نابووتو خەراپە . رۆمانی (کوێنس کراسیّك جیبۆن)ی «ئەسکوتس کویر» بەرای من یەکیّکە لە رۆمانە دەگمەنو سەرکەوتووەکانی ئەم سەدەیە کە لە بەرتیانیادا چاوی بە روناکی شاد بوو . (هیچی ترم نیە بیری لیّ بکەمەوە) ، ، ئەو رۆمانە باسی ژیانی بەشیّك لە ئسکتلەندە) دەکات لە دارستانو لادیّو شارە بچووکەکان ، بەلاّم لەگەلّ ئەوەش‌دا ئەو بەشە بچووکە لە جولاّنەوەیدا دەبیّ بە ویّنەیەکی بچووکی میّژوو ، کۆمەلّی (میرنز) ، بەشیّکە لە (ئسکتلەندە)و (ئسکتلەندە)ش بەشیّکە لە جیهان و جیهانیش دونیای دویّنیّو بەیانیە شان بەشانی دنیای ئەمرۆکە . . دا دابنیّین دەتوانین کەسە زیندووەکانو دەمەتەقیّیە دەربرەکە – الحوار المعبر– و شیعرو قۆشمەبازیو توورەییو هەلّچوونو زمانی روونو کاریگەر لە رۆمانتیّکی واقیعی نویّی تر ئەدۆزیتەوە (بۆ نموونە شەوی شەممە وا بەیانیەك شەممە) . بەلاّم دوور لە تیّگەیشتنەکەی (جیبۆن)بۆ (سروشتو جولاّنەوەی میّژوو ، رۆمانی (ئەسکوتس کویّر) تەنیا خۆشەویستیو ژیانی (کریس قوثری)مان پیّ رادەگەیەنیّ ، کە دەتوانیّ یەکسەر کاری فلیمیّکی رەونەقدارە سەرنج راکیّش بکاتە سەری . .

ئەو هەلّپەرستیە خەفەتناکو نەخۆشو ئەژنۆ چەماوو ترساوە لە بەندکردن کە بەشیّوەیەکی دیار لەئەدەبی هاوچەرخدا باس دەکریّ ، نموونەی بیری سروشتی ئادەمیزادە . . هەروەك (جونون)ی شاعیر لە گوتاریکیدا ووتی : «مرۆڤ دورگەیەك نیەو مردنی مرۆڤەکە ببیّتە هۆی لەناوبردنی من لەنیّو کۆمەلّی ئادەمیزاددا ، چونکە من لەناو ئەوانا ئەژیم ، بۆیە مەپرسە زەنگەکان بۆچ لیّدەدریّن ، ئەوانە بۆ تۆ لیّدەدریّن .

«کراسیك جیبۆن» لەو دیّرە قوولّە راستگۆیانەی روناکی ئەبەخشیّ کە لە رۆمانەکەیدا بە (ئیوان تافندیل) ئەگەین ئەو کورە هیّمنو خاوەن دەرروونە بەرزەو ئەو دوو دەستە ساردو تەنیایە کە هەمیشە لەنیّو خۆیدا بەند کراوەو جگە لە خۆی پشت بە کەسی تر نابەستیّو تازەکی بووە بەکاریّکی کاریگەر لە پیّك‌هاتنی «پەیوەندی لاوە کریّکارەکان»داهەر لە ئاهەنگی سەماکردنیش‌دا خستیانە ریزی ریّکخراوەوە . لە چرکەیەکی ئادیاردا بۆ (ئیوان)دەرکەوت ، کە ناتوانیّ بیّ بەو کەسەی کە لەسەر ریّبازو ریّچکەیەکا لەسەری ئەرۆیشت ، بەلّکو ئەیەویّ ببیّتە بەشیّك لەوان . . رووە شەرمناوی رەنگ بەفریەکەی کچە کریّکارەکەی رستنو چانیە ئەویش بە روویّکی گرژەوە لەنیّو بۆگەنی زبلّو (قالوقیت)ی خویّنو گۆشتو ئیّسکیانا ئەژینو لە گومانو بیرکردنەوەو دلّداریان بیریکردۆتەوە . . بۆیە ئەویش بیری لیّ کردۆتەوەو لەگەلّی ژیاوە . . (ئیوان) ئەوەی بۆ دەرکەوت کە مرۆڤ نیە . بتوانیّ گۆشە گیرو تەنیا بژی . دور لەوانەی لە دەوروبەریّتی ، راستی بۆ دەرکەوت بەهەموو ناوەرۆكو دوریەکیەوە کە ئەو کارە «درندەیەکی خەراپو بەدرەفتاوە» بەگوێرەی تاکە کەس کە هەستیّکی زۆری هەبیّ ، بەلاّم بەخشرابیّ و لەویّوە ژیان لەدایك ببیّت لەلای ئەو مرۆڤەی حەزدەکات بۆ بەیانی بژیّت هەروەکو چۆن حەزدەکات ئەمرۆ بژیّت . . . ! !

# پزیشکی لە ناو کوردەواری دا

عبدالرقیب یوسف

## نەنە کۆتر

### بەشی سێیەم

دوور نیە نەنە کۆتر ناودارترین پزیشکی ژن بووبێ لە کوردستانی عیراقدا. دوای ساڵی ١٩٤٠ ناوبانگی زیاتر دەرکرد، بە ڕادەیەك خەڵك لە قەڵادزەو کۆیەو شەقڵاوەو هەولێرو سلێمانیەوە، بۆ لای نەنە کۆتر ئەهاتن بۆ ڕانیە. وە

گەر نەخۆشەکان زۆر شووربان ، ئەوە بە شوێنیان ئەنارد . . . بۆ قەڵادزە ، سەنگەسەر ، کۆیەو زۆر شوێنیتر ئەچوو .

نەنە کۆتر شارەزاییەکی زۆر باشی بووە لەمەڕ پزیشکیی میللی کوردیەوە . جۆرەها نەخۆشی ، وەکو – ژانە سك ، سەر ئێشەو لەرزو تاو . . زگچوون ، ژانە گوێو چاوئێشە –ی چارەسەر دەکرد .

ئەڵێن ، نەنە کۆتر ، ناوی لە نەخۆشیەکانی منداڵانو ئافرەتان زۆر دەرکرد بوو . ئافرەتێ منداڵی بۆ نەبوایە یەکسەر دەچووە لای . وە ئەویش کە سەیری ئەکردن یەکسەر پێیانیانی دەوت کەوا منداڵیان دەبێ یان نابێ . ئەڵێن گشت جار قسەکانی راست دەرئەچوو .

نەنە کۆتر ، جۆرەها برینیشی دەرمان ئەکرد . برینی خەنجەرو گوللەو . . هتد . گەلێ جاریش بە دزیەوە ئەچووە هەندێ دێ وەك بوسکێنو سندولان – لە نزیك رانیەدا – ، بۆ دەرمانکردنی ئەو بریندارانەی کە لە ساڵانی ١٩٦١– ١٩٦٧ ، نەئەوێران بێن بۆ ناو شارو بۆ نەخۆشخانە بچن . بەمەوە– خزمەتێکی بێسنووری ئەوتۆی پێشکەش بە نەتەوەکەی کردووە ، لەبیر ناکرێو نابێ قەتیش لەیاد بکرێ .

بەڵێ . . نەنە کۆتر ، دەستێکی باڵاو شارەزاییەکی تەواویشی بووە لە چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی چاوگرِبوونو رەشبینی چاو .

جاران لە کوردەواریدا ، بەتایبەتی لە ناوچەی رانیەدا ، بۆ رەشبینی چاو ، پیسایی (شەمشەمەکوێر) یان بەکار دەهێنا . پیسایی شەمشەمەکوێر لە (طب)ی کۆنیشدا ، بۆ چارەسەرکردنی هەمان نەخۆشی هاتووە ، ئەمەش ئەگەرێتەوە سەر ئەوەی کەوا گۆشتو خوێنو میزو شیری ، بۆ چەند نەخۆشییەك سوودی هەیە .

لەم بارەیەوە ، داود الأنطاکی ئەڵێ : «و بوله و لبنه یسمیان شیرزق قطع بیض متخلخة في بیوته شدیدة الجلاء و الحدة تقلع الآثار وا لاکتحال بها یحد البصر» .

• پزیشکی چاو ، عبدالله الأشبیلی وتوویەتی کەوا مێشكو خۆڵەمێشو شیری ، دەرمانی چاوە . وە (شیرزق) شیریەتی . هەندێك لە پزیشکانی پێشوو (شیرزق) بە پیسایی ئەو دەزانن . هەروەك ابن البیطارو المظفر الرسولی وتوویانە :[1]

## هەندێ نەخۆشیو دەرمانەکانی

نەنە کۆتر بۆ چارەسەرکردنی هەندێ نەخۆشی ئەم دەرمانانەی خوارەوەی بەکار دەهێنا :–

**١ – بۆ سووتان :**

پیوازی سوورو سپی لەگەڵ سماق دەکوتاو ئەیخستە سەر شوێنی سووتاو .

**٢ – بۆ ژانەزگ (زگ ئێشە) :**

(گیا بەیبونە)ی ئەکوڵاندو لەگەڵ شەکەر تێکەڵی ئەکرد . . ئەوجا دەیدایە نەخۆشەکە . زۆر بەکار بوو . نەخۆش زوو چاك دەبووەوە .

**٣ – بۆ ژانە گوێ :**

أ – گوڵی هێرۆی لەگەڵ شیر ئەکوڵاند . یەك دوو دڵۆپی ئەکردە گوێو ، ژانی ئەشکا . ب – پەڵکە خۆخی ئەکوتا تا ئاوی لێ دەهات . ئاوەکەی لە گوێی ئەکردو دەستبەجێ ژانی ئەشکا .

**٤ – بۆ ژانی لووت :**

ئاوی پەڵکە خۆخ .

**٥ – بۆ ددان ئێشە (ژانە ددان)و ئاوسانی پووکی ددان :**

پونگو سماقو خوێ .

جارێکیان خواڵێخۆشبوو ، مەلا فاتح عەسکەری ، کە پیاوێکی تێکۆشەر بوو لە رانیە دائەنیشت ، پووكو ددانەکانی ژان ئەکرد . زۆر بە ئازار بوو . سەری لە زۆر پزیشك دابوو راسپاردەی زۆری لەمو لەو وەرگرتبوو بەڵام بێ ئەنجام بوو . سەرەنجام ، چاری نەما جگە لەوەی کە هەر ئەبێ ددانەکانی بکێشێ . رۆژێکیان بیری ئەوەی کردەوە بچێتە لای نەنە کۆتر بزانێ ئەو ئەڵێ چی . چووە لای نەنەو ئەویش پێی ووت : گەر پونگی تەڕ لەگەڵ سماقو خوێ بخۆی چاك دەبیتەوە . . . ئەویش بەکاری هێناو پاش ماوەیەکی کەم چاك بووە .

ئەم دەرمانەی کوردەواری بۆ دەم و ددان ، لە سەرچاوەکانی پزیشکیی کۆنیشدا هاتووە . پزیشکانی موسڵمان ، پونگو سماق بە دەرمانی ددان– ئێشە دادەنێن . هەر یەکە بە جۆرێك باسی کردووە . وە تیاشیان هەبووە ووتویانە بۆ ژانە گوێو گرو ئاشکیش بەسوودە ابن بیطار ئەڵێ ، فوتنج (پونگ) «اذا مضغ نفع من جع الاسنان» .

ابن هبل ئەڵێ : فوتنج «تشد اللثة . . . یفید في الاورام

والمغص يقتل البرى الديدان . . . داود الأنطاكي – يش ، به دوورو درێژی لەژێر ناوی (نعناع)یانی قوتنج – پونگ–دا لەم باسە کۆڵیووەتەوە و ئەڵێ «یسکن وجع مصنفاً» .[٢]

پزیشکی کورد ، مەلا محمود ، پوونگی زەرد بە دەرمانی قوڵنجو مایسیری دادەنێ .[٣]

لەمەڕ سماقەوە ، ابن البیطار ئەڵێ ، ئەگەر بیخەیتە ناو ددانی کلۆڵ ئەوە ژانی دەشکێ . کەچی ابن هبل ئەڵێ ، وا چاکترە لەگەل مازیو دەنکی (ئاس)بێت . . . زیاتر سوود دەگەیەنێ . وە لەبارەی بەکارهێنانی سماق بەتەنیا ئەڵێ « یسکن وجع الاسنان ویمنع قیح الأذن . . .)[٤]

أنطاکی ئەڵێ گەر هاتوو سماق زۆر کوڵێنرا تا وەك شیلەی هەنگوینی لێ دێ . . . ئەوە بۆ پەنەمو برینو پووکی نەخۆشو کەوتنە ڕێی خوێنی منالدان یەگجار باشە .[٥]

ابن سینا ، کووتانی سماق لەگەل ماویو شەبو گوڵە هەنارو ڕگو توێکلێ هەنار ، بە باشترین دەرمان بۆ ئاوساوی دەمی منالێ دادەنێ .[٦]

سوودی پەلکە خۆخ «گەلای خۆخ» بۆ ژانە گوێ ، لە سەرچاوە پزیشکییەکاندا هاتووە (رازی) ئەڵێ : (ماء الخوخ یقتل الدود فی الأذان اذا صب فیە» .[٧]

هەروەها– ابن هبل – یش ئەڵێ ، ئەم دەرمانە بۆ کرم هەبوونیش باشە .[٨]

لەمەڕ گوڵە (هێرۆ) شەوە ، کە نەنە کۆتر لەگەڵ شیر دەیکولاند بۆ ژانە گوێی بەکار دەهێنا ، دەبینین پزیشکانی موسلمانانیش سوودی هیرۆ بۆ چەند نەخۆشی ، وەك ئاوسانو نەخۆشی گوێو برینو پێوەدانی دووپشك ، بە باش دەزانن .

(رازی) لەگەل چەند شتێکی ترەوە بە دەرمانی گوێ دایدەنێ . . ئەڵێ «فی وجع الأذن یستعمل الخطمی مع البابونج واکلیل الملك وبنفسج یابس و دقیق الشعیر» .[٩]

هەروەها (ابن بیطار) و (ابن هبل) یش بە دەرمانی ژانە گوێی دادەنێن .[١٠]

دەربارەی (گیا بەیبونە) کە لە کووردەواریدا بە دەرمانی زگ ئێشە (ژانە زگ) ناوی دەرکردووەو نەنە کۆتریش زۆر بەکاری هێناوە . لە زۆربەی زۆری کتێبەکانی پزیشکیی کۆندا لە ژێر (خیری) یان (منثور)دا ناوی هاتووە .

ابو عمران القرطبی (موسی بن عبدالله) کە یەکێك بووە لە پزیشکە بەناوبانگەکانی (أندلس– اسپانیا) بە (بابونە) لە کتێبی (شرح اسماء العقار) ناوی بردووە .[١١]

لە هەندێ سەرچاوەی تریشدا بە (١٢) جۆر ناووشێوە هاتووە .[١٢]

پزیشکەکان وای بۆ چووینەکەوا بۆ زۆر جۆر نەخۆشی بەکار دێت ،وەکو نەخۆشیەکانی چاوو ددانو منالێ لەبەرچوونو ئاوساوی فاتەرەشەو منالدانی ژن . وە هەروەها بۆ (باداریی چۆك) ، هەوەك (ابن بیطار) و (الملك المظفر) ئەڵێن ، دەرمانێکی چاکە .

نەنە کۆتر ، لە بەهاراندا ، رووی لە دەشتو کێوی رانیە ئەکردو ، جۆرەها گیای کۆ ئەکردەوەو ووشکی ئەکردو لە کاتی پێویست بەکاری دەهێنا .

هەندی جاریش ئەچووە بەغداو هەندێ جۆرە گیای لە عەتارەکانی ئەوێ ئەکریو ئەیهێنایەوە بۆ ماڵەوە .

نەنە کۆتر ، زۆر جۆر دەرمانی ئەگرتەوەو بۆ زۆر نەخۆشیو دەرد بەکاری دەهێنا .

داخەکەم . . . ئێمە ئێستا گشت ئەو دەرمانانەی ئەو دەیگرتنەوەو بەکاری دەهێنا ، نازانین ، بەتایبەتی کەسی لێ فێر نەبووەو ئەم زانیاریانە لای کەس نەماونەتەوە تا بزانین چینو چۆننو جۆن دروست دەکرێن .

## ژیانی نەنە کۆتر :

کۆتر کچی درباسی کوڕی خالیدی شکاکی یە ، لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا ، کە لەشکری رووس هێرشی هێنایە سەر ناوچەی شکاك ، خەڵکی ئەم ناوچەیە رایان کردو خانووبەریان بەجێهێشت . ئیتر کۆتریش ، هەروەك ئەم خەڵکە ، لەگەل هەر سێ براکانی (محمدو مجیدو مصطفی) ئەم ناوچەیەیان بەجێهێشتو سەرگەردان بوو . باوکی لەم هەراو هوریایەدا بێ سەرو شوێن بوو ، ئێستاش لەگەڵدا بێ کەس نەیزانیووە بۆکوێ چووەو چی بەسەر هاتووە . دایکیشی لەپێش ئەوەوە گیانی پاکی بە خاك سپارد بوو .

کۆترو هەر سێ براکانی ، سەرگەردان بوون . . . ڕێگای هەریرو باتاسیان گرتەبەر . . . تا لە کۆتاییدا لە رانیە نیشتەجێ بوون . برای کۆتر ، (محمد) کە تەمەنی لە هەشتا ساڵی تێپەر بووەو لەکاتی خۆیدا راوچیەکی بەناوبانگ بووە ، ئەڵێ : «کۆتر لە (شەمسی)ی شکاکی گۆرانی بێژ) فێری پزیشکیی بووە . وە تا ئەوکاتەی مێردی بە (ئاڤدەل)ی شکاکی کردو لەبەر منالێ نەبوون لەیەکتر جیا بوونەوە ، هەر سەرپەرشتی ئێمەی دەکرد .

ژنێکی توره بوو . . به رادەیەك من ژنیشم هێنا بوو ، ئەو هێشتا ، لەکاتی تورەبوونیدا ، بەدار لیّ‌ی دەدام» .

ئەوەی راست بێ من لەم قسەیە دوو دڵ بووم‌و تا لەچەند کەسێکی ترم پرسیار نەکرد ، باوەڕم نەکرد .

بەڵێ . . نەنە کۆتر باشترین خزمەتی پێشکەش بە خەڵکی ،وچە بەتایبەتی‌و کۆمەڵی کوردەواری بەگشتی ، کرد ، گەڵی جار نەخۆشەکان دوای چاکبوونەوەیان شیرو ماست‌و مریشك‌و عەلەشیش‌و گیسك‌و کاورو بەرخیان بۆ دەبرد .

ژنێکی تەماعکار نەبوو . . بیری لای پارەو پوول نەبوو . . تەنیا چاككردنەوەی نەخۆش‌و خزمەتکردنی خەڵکان لای گرنگ‌و بەهادار بوو .

تا ساڵی ١٩٦٧ . . . کە گیانی پاکی بە خاك سپاردوو کەوتە گۆڕستانی نەمران‌و تا دونیا دێت ناوی هەر ناودارترو نەمرتر دەبێت .

شایانی باسیشە ، ئەوەش باس بکەین کەوا لەو کاتەی نەنە کۆتر لە رانیە پزیشك بووە ، پزیشکێکی تریش لە هەمان ناوچەدا هەبووە کە (شەوکەت خان)ی خێزانی ملا صدیق بوو .

ئەم ژنە پزیشکە ، کارەکەی ئایینی وەیا چاکتر وایە بڵێین نەفسی بووە . قورو بەردی گۆڕی پیاو چاکەکانی کۆ دەکردەوە . وەك (شێخ پیرس) لە ئەنگوزی نزیك بێتواتە . . وە ئۆمەر مەندان .

هەروەها (هوکاشە) لە دەشتی هەولێر . . وە (چاکە چکولە) و (بابە سەید عەلی) لە گۆڕستانی رانیەو (بەستە هیزە) لە نزیك رانیە .

خەڵکان ، بەتایبەتی نەخۆشەکان ، زۆر زۆر باوەڕیان پێ دەهێنا . بە تایبەتی چونکە شەوکەت خان ژنێکی بەدین بوو ، (مەولوود)ی دەخوێندەوەو دەنگی خۆش بوو . زەمبیل فرۆش‌و خاتوو زین‌و کاکە مەم (مەم‌و زین) و (سینەم) ، چیرۆك‌و بەسەرهات‌و پاڵەوانی‌ی تری دەزانی‌و لەبەری بوون . بۆ ژنانی دەخوێندنەوە . جارێکیان بۆ منیشی خوێندنەوە .

ئیتر نەخۆشان ئەهاتنە لای‌و ، قوری پیاو چاکێکی بە نێوچاوانیان دەناو . دوعاشی بۆ ئەنووسین‌ولەناو ئاو وەری ئەدان‌و ئاوەکەی بە لەشی نەخۆشەکاندا دائەکرد .

شەوکەت خان . کچی عەلی ئەفەندی (ئەمین سندوق)ی کۆیە بوو . هەر لە منالیەوە فێری قورئان خوێندن‌و (مەولوود) خوێندنەوە بوو . تا ساڵی ١٩٧٢ لە رانیەدا ، سووتاو کۆچی دوای کرد .

**پەراوێزەکان :**

**١ – لە ژێر ناوی (فوتنج) . تەماشای کتێبی ناوبراوی (أنطاکی) بکە .**

**هەروەها (ابن هبل) . . «المختارات في الطب» . وە «ادوار غالب» « الموسوعة في علوم الطبيعة باسی «نعناع» .**

**فوتنج– فوذنج– فودنج . . «پونگ»ەو بەناوی (نعناع)یش هاتووە .بەڵام هەندێکیان . وەکو المظفر الرسولی ، هەریەك بەجوودا ناوێکیان بۆ داناوە .**

**یا راست ئەوەیە بڵێین . چەند شێوەی پوونگ هەیە . (پیّ‌گوتنە – حبق- و خەلکی شامی بوی بە رێ گوتنە (صعتر) و هەروەها (مکشطر)یش شیوەییك ئەلێن زیاتر (نعنع) بوی بوستانی ئەلێن .**

**لە (طب)ی یۆنانیشدا . وا دیارە کەوا گیایەکی پزیشکی‌ی بەنرخ بوو/ . ناوە یۆنانیەکەی (غلیجن)ە . بە ئەسڵ ناوی (پونگ – پوتنگ)ە کە ناوێکی کوردی‌یە . . . یا باشتر ئەوەیە بڵێین ووشەیێکی ئاری‌یەو . پزیشکە موسڵمانەکان کە وەریانگرتووەو لە کتێبە عەرەبیەکانیاندا بە ناوی (فوتنج) بەکاریان هێناوە ئەم ناوەیان بۆ داناوە . بەتایبەتی چونکە لە عەرەبیدا پیتی (پ) یان کردووە بە (ف) .**

**٢ – دەستنووسا «طب کوردی . . ل ٣ ، ٧ .**

**٣ – الجامع لمفردات الأدوية والأغذية . المختارات في الطب ، لەژێر باسی (سماق)دا**

**٤ – التذکرة : «سماق» .**

**٥ – د . محمود الحاج قاسم : تأريخ طب الأطفال عند العرب . ل٣٢ بغدا ١٩٧٨**

**٦ - أبوبکر الرازی الحاوی ب ٣ ل ٥٢ . ٥٣ .**

**٧ ابن هبل المختارات – باسی (خوخ) هەروەها التذکرة لەژێر باسی (اجاص-دا**

**٨ الحاوی ب ٣ ل ٣٤ .**

**٩ - لەژێر باسی (خطمي) تەماشای : مفردات ابن البیطارو المختارات بکە هەروەهاش «المعتمد»**

**١٠ شرح اسماء العقار : «بابونە» مایرهوف چاپی کردووە . . ١٩٤٠) .**

**١١ – لەژێر باسی (منثو) تەماشای : «ادوار غالب» «الموسوعة في علوم الطبيعة بکە .**

**قرطبي ئەڵێ : خیری بەری‌و خزامی بەبیونەیە .**

**الرسولی ئەڵێ : خیری بەری‌یە . . .**

**انطاکی یش ئەڵێ خزامی‌و خیری بەری نین . هەروەك ووتمان ١٢ جۆرو چەند ناوێکی هەیە . لەژێر ناوی (خزامي) و (خیری) تەماشای (المعتمد) بکە .**

**١٢ مفردات (ابن بيطار) و (المعتمد) لەژێر ناوی (خیری) . لەژێر باسی (خزامی) تەماشای (التذکرة) بکە .**

**ماویەتی**

پاش ئەوەی بوونی زنجی یەکان لەناو کۆمەڵی ئەمریکادا وەك شتێکی سرۆشتی ی لیٚ هاتەوە . مەسەلەی دەرکەوتنیان لە سینەماو تەلەفزیۆنیشدا سیمایەکی سرۆشتی ی وەرگرت . .

بەلاّم ئەوەی بیەویٚ لە کەسایەتی ئەم زنجی یانە لەرووی هونەری یەوە کەمێك وردبێتەوە ئەوەی بۆ روون دەبێتەوە کە ئەم جۆرە دەرکەوتنانە هیچ شتێك لە مەسەلەکەدا ناگۆرن ، تەنیا هەندیٚ رۆڵی ئاسانو بیٚ کەڵكو بیٚ سوود نەبیٚ . . بەلاّم مەسەلەی سوور بوون لەسەر پێشکەش کردنی ئەم شتە تەنیا بۆ دڵدانەوەی ئەو ژمارە یەکجار زۆرە لەو زنجی یانە نەبیٚ کە بە بەردەوامی رووئەکەنە سینەماکانەوە . . ئەوانەی کە پاشاکانی سینەما لە ولاٌتی ئەمریکادا دانیان بەوە ناوە کە لەبەر زۆریەتی ئەم بینەرە رەشانەدا پێویست بە دروست کردنی هەندیٚ فیلمی تایبەت بە رەشەکان کراوە . . . زنجی یەکان دەریان بهێنن‌و هەر خۆشیان چیرۆکەکانیان بنوێنن‌و هەتا بابەتەکانیشیان پێویستە پیۆەندی یەکەی بەوانەوە بیٚ . .

بەم جورە . قۆناغی حەفتاکان بەم دانپیانانە ئاشکرایە کۆتایی پیٚ هاتەوە . . ئەمە لەپاش سەفەرێکی دوورو درێژ کە بەیدابوونی سینەمای بیٚ دەنگ دەستی پیٚ کرد . .

ئەم سەفەرە ، سەفەرێکی خۆش‌و ناخۆش بوو . . پڕ لە گاڵتە پیٚ کردن‌و چەوسانەوەو توندوتیژی لەلایەن پێست سپی یەکانەوە بوو . . لەلایەن پێست رەشەکانیشەوە بەرگری لەخۆ کردن‌و نارەزایی پیشاندان‌و هەوڵ دان بۆ دامەزراندنی بوون‌و سەلماندنی شەرەف‌و کەرامەت بوو . .

لەنێوان رەش‌و سپی لە قولاٌیی کۆمەڵیٚ ئەمریکادا شەرێکی بەتین‌و بەهێز بووو بە فێڵ‌و مەکرو درندەیی لەسەر شاشەدا رەنگی دایەوە . .

ئیستاکەش لەتوانای پیاوی سپی دا نەما چاو لە واقیعە راستەقینەکە دابپۆشیٚ . . . رەشەکان وایانی لیٚ هاتەوە



**بنه بناغەیەکی بەرهەمدارو لە ئابووری ئەمریکادا بە شێوەیەکی ئاشکرا رۆڵی خۆیان بینن‌و گەورەترین پلەو شوێنیان وەرگرت‌و گەییشتە ئەو ئەرکانەی کە پێوەندی‌یەکی زۆریان بە رامیاری ئەمریکاوەیە . . بەڵام هەتا ئەمرۆکە هەندێ لەو پیاوە سپی‌یانە هەن کە بەو مێشکە کۆنە ئەژین‌و بیرئەکەنەوەو دژ بەوە ئەوەستن کە رەش‌و سپی وەك یەك بن ، چونکە لایان وایە رەش پلەی کەمترەو هەرچەندە رۆڵەی ئەم نیشتمانەیە بەڵام ئەبێ نزم‌تر بێ‌و لە پلەی دووەم‌دایە . .**

**هەندێکی تریش لەو پیاوە سپی‌یانە ئەوە ئەدەن لە رەشەکان نزیك‌بنەوە ، ئەوەش لە ئەنجامی هەست بە تاوان‌و گوناه کردن‌دایە . . . کۆمەڵی سی‌یەمیش بە توندی دژ بەوە ئەوەستن‌و ئەڵێن : ئێمە هەست بە هیچ تاوانێك ناکەین بەڵکو رەشەکانن کە هەست بە گرێی چەوسانەوە ئەکەن . .**

**مەسەلە دەروونی‌یەکەش هەتا ئێستاکە کپ‌و هێمن نەبووەتەوە . . باشترین بەڵگەش بۆ ئەم مەسەلەیە ئەو سەرسوورمان‌و بەزەیی‌یەیە کە بەهۆی پێشکەش‌کردن‌و پیشاندانی فیلمی (رەگو ریشە) لە ئەمریکاو ئەورۆپا وەدەرکەوت . . .**

**بینەرانی تەلەفزیۆن دۆزینەوەی دراوسێە رەشەکانیان دوبارەکردەوە . . یان ئەوەیان بۆ ساغ‌بووەوە کە هەندێ جار پێویستی‌یان بەوە ئەبێ بیر لە کردەوەی باوك‌و باپیران‌یان بکەنەوە . . ئەوانەی دانشتوانی ئەفریقیایان لە ماڵ‌و نیشتمانەکەیان‌دا رفاندن‌و لە بازاری کرین‌و فرۆشتن‌دا وەك شت‌ومەك فرۆشران . . ئەو کردەوەیە کە بوو بەهۆی پەیداکردنی ئازاری دەروونی‌ی مرۆڤایەتی ، ئەو ئازاردانە کە بەهۆی جیاوازی رەنگەوە هاتەکایەوە . .**

**ئەوەتە بەشی دووەمی فیلمی (رەگو ریشە) لە رێگەی پێشکەش‌کردن‌دایە بە مەبەستی ئەوەی پەرەو خۆشی بە سۆزی مرۆڤایەتی ببەخشی‌و چەند شتێکی‌یش دەربارەی ئەم تراژیدیایە مرۆڤایەتی‌یە پێشکەش‌بکات .**

**قۆناغی سینەمای بێ‌دەنگ:**

زنجی‌یەکان لە فیلمە سەرەتاکانی ئەمریکادا وەدەرکەوتن‌و بەتایبەتی لەو فیلمانەی کە (تۆماس ئەدیسۆن) پێشکەش‌و توماری ئەکردن . .

مێژووی سینەما ئەوەی دەرخستوەتەوە کە زنجی‌یەکان لەم فیلمانەدا رۆڵیان بینیوە : (سێ پیاوە سەماکەرەکان — ١٨٩٤ و(سەمای زنجی‌یەکان — ١٨٩٥)و (سەماکەرە زنجی‌یەکە — ١٨٩٧) .

لەو ماوەیەدا کومەڵێکی تری سەر بە سینەما هاتە پێشەوەو منافەسەی فیلمەکانی (تۆماس ئەدیسون) ی کردو هەمان رێبازی گرتەبەرو هەوڵێکی یەکجار بێ‌وچانی بۆ ئەوە کەڵك‌و سوود لە زنجی‌یەکان لە فیلمە بێ‌دەنگەکاندا وەربگرێ‌و فیلمێکی بەناوی (سەمای رەش — ١٨٩٧)دا پێشکەش‌کرد .

ئەوەی ئاشکرایە ئەو جۆرە فیلمانە وەك دۆزینەوەیەکی کورت وابوون‌و رێگەیان بۆ ئەم داهێنانە گەورەیە خۆش‌ئەکرد . . ئەم جۆرە فیلمانە چوارچێوەیەکی درامی‌ی سنووردار‌یان نەبووو هەتا زنجی‌یەکانیش بگرە هیچ جۆرە رۆڵێکی دیاری‌یان تێدا نەبوو جگە لە دەرخستنی هەندێ سەماو هەڵپەرکەی تایبەتی . .

لە کتێبێکدا لەم دوایی‌یە لەلایەن (جیم بینیس)ەوە دەربارەی رەشەکان بلاوکراوەتەوە دەربارەی ئەم قۆناغە ئەوە دەڵێ :

(فیلمە زنجی‌یەکان لە سەرەتادا بەکەڵك‌و بەسوود بوون . نەك تەنیا لەلایەن شێوە گاڵبەجاری‌یەکانیایەوە بەڵکو لە لایەنە پێ‌ناسینەکانیانەوە کە ئەمە شتێکی زۆر گرنگە .) . . بێ‌گومان ئەوەی دانەرەکە مەبەستی‌یەتی پێ‌ناسینیان لەسەر ئەرزی ئەمریکادا . . ئێمە ناتوانین گرنگی‌یەکی ئەوتۆ بەو سەرەتایە بدەین ،



یان وای لێ بکەین لە چوارچێوەی رۆڵی زنجی یەکان لە سینەمای ئەمریکایی دا بژمێررێت . . چونکە ئەو سەرەتایە تەنیا تاقیکردنەوەیەکە بۆ ئەم جۆرە هونەرە . . بەڵام شان بەشانی پەرەسەندنی سینەماسازی و لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا فیلمی وەها دەرکەوت زنجی یەکان بتوانن رۆڵی تیادا بنوێنن . . بەڵام بەداخەوە زۆربەی ئەو رۆڵانە هەوڵی یان ئەدا ئەوە بسەلمێنن کە ئەم زەلامە رەشانە نرخ و زیرەکی و مرۆڤایەتی یان لە پیاوە سپی یەکاندا کەمترە ، بۆیە بۆ هیچ جۆرە ئیش و کارێك دەست نادەن تەنیا بۆ نۆکەری و خەڵق بە پێکەنین هێنانەوەو حەزکردن لە چەپۆك نەبێ ، یان بۆئەوەی کە وەك درندەیەکی چەقۆ بەدەست و سرۆشت تیژو توند پیشان بدرێن . .

ئەوەی سەیریشە کە فیلمەکانی ئەو قۆناغە ، واتە قۆناغی سینەمای بێ دەنگ ، هەرچەندە بۆ نواندنی هەندێ لە رۆڵەکانی دا پەنای بۆ پیاوە رەشەکان ئەبردەوە بەڵام نوێنەرەکان تەنیا لە پیاوە سپی یەکان بوون و بۆ ئەم مەبەستەش روویان بە رەنگێکی رەش بۆیاغ ئەکردو هەوڵێکی زۆریان ئەدا بۆئەوەی دەم وچاویان بە رەنگێکی سپی ی یەکجار تیژ پیشان بدەن بە مەبەستی شێواندن و گاڵتەجاری یەوە .

لە ساڵی (١٩١٥)دا یەکەمین فیلم پێشکەش کرا کە بە چاوێکی پڕ رێزەوە بو/ زنجی یەکان ئەروانی و بە چوارچیوەیەکی مرۆڤایەتی یانەی راستەقینەوە پێشکەشی ئەکردن . . ئەم فیلمە بەناوی (لەدایك بوونی نەتەوەیەك) بووە (دیڤید جریفیت)ی مەزن دەری هێنابوو ، ئەو فیلمە دەربارەی شەرە ناخۆیی یەکەی ئەمریکا ئەدوا . فیلمەکە بێ دەنگ بوو ، بەڵام لە کاتی خۆی دا وەك کارێکی هونەری زۆر بەرز ناسرا و باشترین بەڵگەش بۆ سینەما بوو لە مەسەلەی دەربرین دا ، واتەئەوەی سەلماند کە سینەما ئەتوانێ دەربارەی بابەتەوە زۆر شت بە خەڵق بگەیێنێ . . فیلمەکە هەتا رۆژی ئەمرۆ لەلایەن هونەرەوە نرخێکی زۆری هەیەو وەك سەرەتایەکی راستەقینەی جیهانی بۆ دامەزراندنی سینەمای ئەمریکایی دائەنرێ . .

### سینەما بەهۆی گۆرانی بێژێکی زنجی یەوە دەنگی هەڵبری :-

وا رێکەوت کە یەکەمین فیلمی قسەکەر لە مێژووی سینەمادا فیلمێکی ئەمریکایی بەناوی (جاز بێژ) بێ . . ئەو فیلمە دەربارەی گۆرانی بێژێکی زنجی ئەدوا کە بە مەستی گەیشتن بە بەناوبانگی و نەمری بوو . . ئەم زنجی یە گۆرانی بێژە (ئال جۆنس) بوو کە بە بۆیاغێکی رەش لەرووی خۆی دا بووە دەم وچاوی بە رەنگێکی سپی دەرخستبوو . .

رۆژی (٢٣)ی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٢٧)دا بە رۆژی لەدایك بوونی سینەمای قسەکەر دائەنرێ و بەتایبەتی بەهۆی پێشکەش کردنی ئەم فیلمەوە . . بەڵام ئەوەی شایانی باسە ئەمەیە کە ئەم فیلمە تەنیا قسەکەرەو بەس . . .

ئەم نوێنەرە سپی یە ، واتە ئال جۆنس ، بەهۆی ئەم رۆڵەیەوە زۆر بەناوبانگی ی وەرگرت . . دانەری کتێبی (رەشەکان لە سینەما) دا دەربارەی ئەم ئەکتەرەو چۆنیەتی بۆیاغ بەکارهێنانی ئەڵێ : (لە فیلمە بێ دەنگەکاندا زەلامە سپی یەکان بە رووپوش و جموجۆڵە ساکارەکانیانەوە لایان وابوو وەك زنجی یەکانیان لێ هاتوەتەوە . بەڵام بە رێگەیەکی نارێکەوە ئەمەیان ئەکرد . . بەڵام (ئال جۆنس) هیچ جۆرە گرنگی یەکی بە لاسایی کردنەوەی زنجی یەکان نەدابوو تەنانەت بۆیاغە رەشەکەی دەم وچاویشی بۆ مەبەستێکی دراماتیکی تایبەت بەکارهێنابوو . . ئەوەی لە فیلمەکەدا دیارە ئەکتەرەش وەك شتێکی سەیرو عاجباتی لێ هاتبوو نەك وەك زنجی یەکی شێواو . .

**یەکەم فیلمی راستەقینە دەربارەی زنجی یەکان :-**

پاش پەیدابوونی فیلمی قسەکەر بە دوو ساڵ . . واتە لە ساڵی (١٩٢٩)دا فیلمی (هالیلویا) ی دەرهێنەری ئەمریکایی (کینج فیدۆر) هاتەکایەوە . . ئەم فیلمە بە فیلمی ژمارە یەك ناوبرا ، واتە چاکترین و بەرزترین فیلم دەربارەی زنجی یەکان لە سینەمای قسەکەردا . .

بە پەیدابوونی ئەم فیلمە قۆناغی دووەمی فیلمی (لەدایك بوونی نەتەوەیەك) دەستنیشانکرایەوە ، چۆنکە تەکنولۆجیای سینەماسازی بە دادپەروەری روانین بۆ مەسەلەی زنجی یەکان لە کۆمەڵی ئەمریکادا تێکەڵکرایەوە . .

چیرۆکی ئەم فیلمە لە کشتێکی لووکە لە ئەمریکای خواروودا رووئەدات . . هەروەها بەشێوەیەکی زۆر ورد تیشك ئەخاتە سەر بوونی زنجی یەکان و شێوەی ئیش وکاریان و بەردەوامی بەجەرگی یان لە باردۆخێکی پڕ لە گۆرانی فۆلکلۆری و سەماو نوێژدا . .

رەخنەگرەکان گرنگی یەکی زۆریان بەم فیلمە داو بەتایبەتی ئارەزووە دڵسوزەکەی داهێنەرەکە لە پێشکەش کردنی ئەو کەسایەتی یە مرۆڤایەتی یانە کە پڕ هەستن . .

ئەم فیلمە بەوە مایەوە زنجی یەکان بە شێوەیەکی راستەقینەو بەشەرەف پێشکەش بکات ، هەتا شەری دووەمی جیهانی کۆتایی پێ هاتەوە . . هەتا ئەو کاتەی کە سینەمای ئەمریکی بۆ بیروزو روانینی پیاوە سپی یەکان گەرایەوە لە پێشکەش کردنی رەشەکان لە چوارچیوەیەکی گاڵتەجاری یانەو کەسانێك وەك نۆکەری لاسایی یان وەك دەم هەراشێ کە هەمیشە بەر چەپۆك



ئەکەویٚ . .

**ئەو ئەستێرەیەی کە ئەستێرەکانی سینەما قووتیان دایەوە :-**

لە کتێبێکدا کە لە سەرەتای حەفتاکاندا لە ئەمریکا دەرچووە بە ناوی (سی ساڵ لە خیانەتدا) . . دانەرەکەی (ئیریك بنتلی) چەند بەشێك دەربارەی ئەو زنجی‌یانەی کە خیانەتیان لە مەسەلەکەیاندا کردوە تەرخانکردووەو لەوانە ئەکتەری ناسراو (بۆل رۆبسۆن) ، ئەوەی باشترین هەلی لەبەردەما بوو بۆ بەرگری‌کردن لە مافی رەشەکانو بەتایبەتی ئەکتەری هاوری‌یەکانی ئەوانەی لەگەڵ دامو دەزگاکانی ئەمریکا چ لە سینەما یان شانۆ یان لە تۆمارکردنی گۆرانی‌دا هاوکاری‌یان کردوە ، بەڵام ئەم ئەکتەرە هونەرمەندە هیچی نەکردو لەلایەن هەڵویستیشەوە سەرلێشێواو بوو ، لە لایەکدا رەخنەی توندی لە هۆڵیود ئەگرت دەربارەی شێوەی مامەڵەکردنی لەگەڵ رەشەکانداو لە لایەکی تریشەوە لەو فیلمانەدا بەشداری‌ئەکرد کە دژ بە رەشەکان بوون و وەك بەشداری‌کردنی لە فیلمی (لی قەراخی رووبارێك)- ١٩٣٥- ، لەم فیلمەدا رۆڵی ئەمریکایەکی خائینی بینی ، بەڵگەشی بۆ بەرگری لەخۆ کردن ئەوەبوو کە ووتی :- لەپێش دەست‌پی‌کردن بە وێنەگرتنی فیلمەکەدا چیرۆکەکەیان وا بۆ من گێرایەوە کە ئەمە رێکەوتێکی زۆر چاکە بۆ دەرخستنی رۆشنبیری‌و بەهرەی پیاوە ئەفریقی‌یەکان ، واتە ئەکتەرەکە لەم فیلمەدا بە هەڵە چووبوو . . پاش ئەوەی بەشداری لەم فیلمەدا کرد ، دەعوەتیان‌کرد بۆ تەماشاکردنی ، پاشان ئەوەی بۆ روون‌بووەوە کە بەشداری لە شتێك ئەکات تەبریکی ئیمپراتۆری‌یەت‌و ئیمپریالیزمی ئینگلیزی ئەکات ، واتە بەشداری لە شتێکدا ئەکات کە خۆی دژیەتی . . بەڵام سەرەرای ئەوەش نەیتوانی هێرش بباتە سەر فیلمەکە . .

بەڵکو پاش‌ئەوەوە لە سێ فیلمی ئینگلیزی تری هەمان بابەت‌دا بەشداری‌کرد ، ئەو سێ فیلمانە کە داگیرکردنو تالانکردنو خوێن‌رشتنی رەشەکان بە شتێکی رەوا ئەزانن (گۆرانی ئازادی - ١٩٣٧)و (لە رەشەکان - ١٩٣٨) و (خەزنەکانی سلیمان - ١٩٣٨) .

هەرچەندە کە (بۆل رۆبسۆن) ئەکتەرێکی خۆشەویست‌و دەنگ خۆش‌و خاوەن کەسایەتی‌یەکی زیندووبوو ، بەڵام زۆر جێی داخە کە نەیتوانی خۆی بپارێزێ یان هاوری‌یە رەشەکانی بپارێزێ . . واتە (پاشاکانی سینەما سازی لە ئەمریکادا قووتیان دایەوە) . .

**رەش‌و سپی وەك یەك :-**

پاش قۆناغی حەفتاکان ، ئەو فیلمانەی کە دەربارەی رەگەزپەرەستی ئەدوان وەدەرکەوتن . . زۆر جاریش چیرۆکەکە دەربارەی مرۆڤێکی رەش ئەدوا کە بەرامبەر بە زوڵم‌و زۆری پیاوە سپی‌یەکان‌دا بەرگری لە بوونی خۆی ئەکرد . .

یاری کارتێکردنو هێز بەکارهێنان وەك پیاوەکانی سینەما ئەیانەویست لە هەمان کاتدا بەوردی حیساب کرابوو بە شێوەیەك کە نابێ ئەوەندە بە رەشەکان بدرێت زیاتر لەوەی سپی‌یەکان ئەیانەوێ .

لەم قۆناغەدا ئەتوانین دو فیلم دیاری‌بکەین‌و تۆزێ گرنگی‌یان بدەینێ :

فیلمی یەکەم (شتێك لە نرخ)ی دەرهێنەر (ریتشارد بروکس ٥ - ١٩٥٧) ئەوەی رەنگدانەوەیەکە بۆ (کینیا) لەژێر داگیرکردنی ئینگلیزی‌داو تیادا کەسایەتی زنجی وەك ئەوەی بەدوای واقیعە کۆمەڵایەتیەکەی‌و زاتەکەی‌دا بگەرێت پێشکەش ئەکات .

فیلمی دووەم هی (ستانلی کرامەر)ی دەرهێنەرە کە لە ساڵی (١٩٥٨)دا بەناوی (زنجیرەکانم شکاند) دەرکەوتووە ، ئەم فیلمە بەسەر کەسایەتی زنجی وەك پیاوێکی باش کە بەرگری لە خۆی ئەکات بازئەدات‌و کەسایەتی زنجی وەك ئەوەی بروای بەخۆی هەبێ پێشکەش‌مان ئەکات ، ئەو زنجی‌یەی کە زۆر تیژو توندە بەرامبەر ئەوەی بیەوێ کەرامەتی پشکێنێ ئەوەستێ . کەسایەتی‌یەکی لە دڵەوە زۆر نزیك لەبەر مرۆڤایەتی‌و حیکمەتەکەی . .

ئەم کەسایەتی‌یە بەرامبەر کەسایەتی پیاوی سپی ئەوەی سرۆشت تیژو دژ بە رەشەکانە . داهێنەرەکە ئەم دوو کەسایەتی‌یە دژ بەیەکە لە سنوورێکی ئاسنین دائەنێ . . هەردوکیان لە زندان رایان‌کردووەو بەدوی ئازادی‌دا ئەگەرێن‌و ئەو پێوەندەی‌یەی لەنیوانیانا هەیە تووشی کۆسپ‌و تەگەرە ئەبێ تا ئەگاتە رادەیەکی هاوبەش لە مرۆڤایەتی‌و لەیەك گەیەشتن‌دا .

ئەم دارشتنە دراماتیکی‌یە زۆر بە دەگمەن لەناو فیلمە ئەمریکیەکاندا بەدی ئەکرێت‌و بەتایبەتی ئەوانەی رەش‌و سپی لە هەڵویستا یەك‌بن .

ئەکتەری رەشی لێهاتوو (سیدنی بواتییە) قارەمانی هەردو فیلمەکەیە . . لە فیلمی یەکەمدا بەرامبەر بە (روك هدسون)و لە دووەمیش‌دا بەرامبەر بە (تۆنی کێرتس) .

**بەناوبانگترین ئەکتەری رەش :**

(سیدنی بواتییە) بە بەناوبانکترین ئەکتەری رەش دائەنرێ . . چۆنکە بە



ژمارەیەکی زۆر لە فیلمەکاندا ناوی بەستراوەتەوەو دوو نی‌یە گرنگەکانیشان بێ لە قۆناغی شەستەکان‌و سەرەتای هەفتاکاندا . .

فیلمەکەی (سیدنی بواتیە) – لە گڕی شەودا – کە لە ساڵی ۱۹٦۷ دا پیشان‌دراوە بە بەرزترین فیلمی قۆناغی شەستە کان لە سینەمای رەشەکاندا ئەژمێررێت . . لەم فیلمەدا چاومان بە کەسایەتی زنجی‌یەك ئەکەوێت کە پۆلیسێکی هوشیارو شارەزایەو لە پێشەکەی‌دا مێشکی خۆی بەکار ئەهێنێ بە پێچەوانەی کەسایەتی سەرۆکی پۆلیسەکان (رۆد شتایجر )

ئەم رۆڵەی بینیەوە) کە بە هێزی بازووی بیرئەکاتەوە .

پێش دەرکەوتنی ئەم فیلمە ، (سیدنی بواتیە) سەرکەوتنێکی گەورەی لە فیلمی (بۆ ماموستاکەم لەگەڵ خۆشەویستی‌ما) ساڵی (۱۹٦٦) دا بۆ خۆی پەیدا کردبوو . . فیلمەکە (جیمس کلافیل) دەری‌هێنابوو ، . . ئەم فیلمە باسی چیرۆکی ماموستایەکی زنجی ئەکات ، مامۆستایەکی رەش لەناو قوتابخانەیەکدا رووبەرووی ئەو قوتابیانە ئەبێ کە بە چاوێکی تایبەتی‌یەوە بۆ رەنگەکەی ئەڕوانن .

لە هەمان ساڵ‌دا ، واتە لە ساڵی (۱۹٦٦)دا ، (ستانلی کرامەر) دەرهێنەری فیلمی (زنجیرەکانم شکاند) گەڕایەوە بۆئەوەی. فیلمێکی تر دەربارەی زنجی‌یەکان‌و جیاوازی رەگەز دەربهێنێ . . لەم فیلمەش‌دا (سیدنی بواتیە) رۆڵی پاڵەوانی بینی ، مامۆستایەکی زانکۆ ئافرەتێکی لە سپی‌یەکانی خۆش‌ئەوێ ، باوکی کچەکە خاوەن رۆژنامەیەك دەبێ‌و بە بەردەوامی لەبابەت رەش‌و سپی ئەنووسێ‌و هەمیشە داوای ئەوە ئەکات کە ئەبێ لەنێوان رەش‌و سپی‌دا هیچ جۆرە جیاوازی‌یەك نەبێ . . بەلام لێرەدا ئەم

پیاوە تووشی گیروگرفت دەبێ ، پیاوێکی
رەش داوای هێنانی کچەکەی ئەکات . .
هەڵەچیی‌و ئاگای لەخۆی نامێنێ‌و بە
هەموو هێزێکەوە هەوڵ‌ئەدا ئەم شتە نەبێ
(سبنسەر تراسی رۆڵی پاڵەوانی تیایا
بینیبەوە) . . واتە قسە ئاسانەو کردەوە
زۆر گرانە . . گرانتریش ئەوەیە کە پیاوی
سپی بتوانێ لەو گرێیە رزگار ری‌بیی‌و
پیاوی رەشی بە کەمتر نەبینێ . .

ئەم فیلمە (بزانە کێ بۆ خواردن دێت)
بوو کە سێ پاداشتی ئۆسکاری لە ساڵی
١٩٦٧ بەجاری وەرگرت ، چونکە
باشترین فیلم‌و باشترین سیناریۆ بوو . .
باشترین کچە ئەکتەریش (کاترین
هیبورن) بوو کە رۆڵی دایکی نواندبوو لە
تێکەڵاوبوونێکی سەیردا لە رق‌و
سەرشێواوی‌و رازی‌بوون بە واقیع دا . . لە
یەکێك لە پەردەکانی ئەم فیلمەدا بە
مێردەکەی ئەلێ بە شێوەیەکی تێکەڵ بە
داخ‌و گاڵتەوە : (کچەکەمان وەك چۆن
پەروەردەمان کرد هەر واش جولایەوە . .
ئێمە هەمیشە وڵامی پرسیارەکانی‌مان
ئەدایەوە ، زۆر جاریش پێمان وتووە : نابێ
بە هیچ شێوەیەك بە روانینێکی جیاواز بۆ
زنجی‌یەکان بروانین . . . هیچ جیاوازی‌یەك
لەنێوان رەش‌و سپی‌و زەردو سووردا
نی‌یە . . ئێمە ئەوەمان پێ وت‌و ئەویش
بروای بەوە کردو بەپێی ئەمەش مامەڵەی
لەگەڵ ژیان‌کرد . . ئەوەی دیارە ئەبوایە
پێ‌مان بوتبیا - بەڵام ئەبێ زۆر وریا بی
لەوەی حەز لە پیاوێکی رەش
بکەیت ! !»

**ساڵەکانی گەشەپێدان :**

گەر بێت‌و قۆناغی شەستەکان
سەبارەت بە سینەمای رەشەکان بە
ساڵەکانی پەرەسەندن‌و بەرهەم‌دار
دابنەین ، ئەبێ قۆناغی حەفتاکان بە
(ساڵەکانی گەشەپێدان) بژمێرین ، چونکە
پیاوەکانی سینەماسازی وایان لێ هاتەوە
بتوانێن رەشەکان بە وێنەیەکی چاکترو بێ
ترس‌و لەرز پێشکەش بکەن ، بەڵکو ئەو
پیاوانە ئەوەندە هەوڵی‌بان دا لە رەشەکان
نزیك‌بینەوە تا رادەیەك سۆپەرمانی رەش‌و
جیمس بۆندی رەش پێشکەش‌بکەن‌و تا
وایان لێ‌هات بیر لە وێنەی یەکەم سەرۆکی
رەش بۆ ولاتەیف کگرتووە کانی ئەمریکا
بکەنەوەوژ هولیود دانی رەشەکان نا وەك
دەرهێنەرو (سیدنی بواتییە) یەکەم فیلمی لە
ساڵی (١٩٧٢) دا دەرهێنا . . هەندێ
ئەکتەری رەشی نوێ دەرکەوتن‌و گەیشتنە
پلەی بەناوبانگی‌و ناوەکان رۆژ بە رۆژ زۆرتر
ئەبوون‌و بیرورا یەکانیش هەروەها . .

ئەم گەشانەوە ئەنجامێکی سروشتی بۆ
تێکۆشانی رەشەکان لە سینەما و هونەر
بەگشتی بوو . . بەڵام تۆ بڵێی گرێ پیاوی
سپی بەرامبەر بە رەشەکان دوایی پێ‌ی
سپی بەرامبەر بە رەشەکان دوایی پێ‌ی
هاتووەتەوە ؟ !
من لەو براوایەدا نیم . .



Roshinbiry Nwe
General Cultural Monthly
Magazine
Issued by: Kurdish Culture
and Publication House
Ministry of Culture and
Information
Baghdad - Iraq

رۆشنبیري نوێ
مجلة ثقافية شهرية عامة
تصدر عن : دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغـــداد

رئيس التحرير
مصلح مصطفى الجلالي

ناونیشان : دار الثقافة والنشر الكردية ساحة الجلاني بغداد
تەلەفون ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەتە

نرخی ٥٠ فلسه

ئەم ژمارەیە ٨٠٠٠ دانەی لێ چاپکراوە

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١١٢ لسنة ١٩٧٩

مسجلة بدائرة البريد برقم ١١٩

مطبعة الاديب البغدادية | هاتف 8881232